# ڕوون

ژمارە ٨

گۆڤارێکی فیکری ڕەخنەیی وەرزییە

**فایلی تایبەت**

## نوێبونەوە لە فیکری ئیسلامیدا



**سەید حسین نەسر: ڕۆژئاوا چاوەڕوانی هەڵوەشاندنەوەی دەکرد ، بەڵام ئیسلام هێشتا لە بزاوتندایە**



**ڕێبوار سیوەیلی : حیزبە ئیسلامییەکان وەرەقەی ئیسلامیبوون لە دەستیاندا سووتا**



**تەحسین حەمەغریب : مەرج نیە ئایین لەهەموو سەردەمەکاندا هەموو ڕۆڵەکان ببینێت**



**هادی عەلی : جیهاد بابەتێکی ئەخلاقییە نەك دینی ، دژی زاڵمانە ، موسڵمان بن یاخود کافر**



**موحەمەد شەحرور: چەسپاندنی چەمکی دەوڵەتی ئیسلامی بەمانا مێژووییەکەی هەڵەیە**



گۆڤارێکی فیکری ڕەخنەیی وەرزییە

ژمارە (8) ساڵی پێنجەم

2016

**خاوەن ئیمتیاز**

**سەنتەری گەشە پێدانی چالاکی لاوان _ ئۆفیسی سەید سادق**

**سەرنوسەر**

**جەمیل عوسمان**
07702161851

**بەڕێوەبەری نوسین**

**وریا باقر**
07702443551
07501562870

**ستافی نوسین**

**موحەممەد موحەممەد**

**ڕێبەر ئەکرم فایەق**

**هاوکاران**

**محمد دلێر**

**کارزان ڕەشید**

**بۆ پەیوەندی**

Rwn2010@yahoo.com

**ژمارەی مۆڵەتی یاسایی (453) سەندیکای ڕۆژنامە نوسانی کوردستانی پێدراوە**



# پێڕست



سەرووتار

وریاباقر



# نوێکردنەوەی گوفتارەکانمان پێش کردارەکانمان

مرۆڤ هەمیشەگوفتارەکانی دەکات بەکردار، بۆیە هەمیشە کردارەکانمان ڕنگدانەوەی گوفتارەکانمانە، بەهەمان شێوەش گوفتارەکانمان ڕنگدانەوەی بیرکردنەوەکان و تێڕامانی ئێمەیە بۆ شتەکانی چواردەورمان، لەخۆڕا نییە زانادەروناسەکانمان دەڵێن( چۆنبیرکەیتەوە تۆئەوکەسەیت)، مرۆڤەکان ژیانی ڕۆژانەی خۆی لەسەربیرکردنەوەکانی خۆی ڕێکدەخات.

ئەوەی ئێستا لەدنیای ئیسلامی وکۆمەڵگەی ئیسلامیدا ڕوودەدات ودەگوزەرێت بەرهەمیی بیرکردنەوە ولێکتێگەیشتنی ئێمەیە بۆ (ئیسلام و دەوڵەت و دەسەلاتداری ). کەزۆربەی شارەزایانی بیری ئیسلامی لەو بڕوایەدان ئەم تێگەیشتنانەی لەڕابردوودا هەبووە هەڵەو کەم کوڕییە لەبارەی فکرو گوتاری ئیسلامییەوە بۆیە هەردەم دەبینین زۆربەی کێشەکان لەجیهان بەگشتی وجیهانی ئیسلامی بەتایبەتی ڕوبەڕوی ئاینی ئیسلام دەکرێتەوە کارەساتەکە لێرەوە دەست پێدەکات .

تائیستاشی لەسەر بێت کارەکانی جیهانی ئیسلامی بەرهەمی ئەو گوتارە تەقلیدی وکۆنەی سەردەمی ( ئومەوی و عەباسییەکانە)، وە زانایان وبیریارانی ئیمە نەیان توانیوە لەو تێگەیشتنە فیقهییە کۆنە بۆدین و دوەلەت داری بەشێوەیەکی گونجاو تێبگەن ئەوەی هەیە دووبارەکردنەوەی هەمان گوتارو گوفتاری ئەوانەن کە لە چوارچێوەیەکی تەسکی جوگرافیایی و ناوچەی دەرنەچووە.

بۆچونێکی (د.هادی علی ) هەیە کەتەواو هاوڕام لەگەڵیدا کە دەڵێت لەجیهانی ئیسلامیدا (مردووەکان حوکمی زیندووەکان دەکەن ) ئەوەی بۆ ئێمە جێماوە فتواکانی ئەوانە وئیمەش دەبێت وەك خۆیان جێبەجی بکەین، بۆیەپێویستە دووبارەگوتاری ئاینیمان دابڕێژینەوە لەسەردەستی زانایان و بیریارانی فکری ئیسلامی دووبارە خوێندنەوەی نوێ بکەن بۆچەمکەکانی (دەولەت ، دیموکراسی ، هاولاتی بون و مەدەنییەت ، سیاسەت و ئابوری و وکۆمەلایەتی و فەرهەنگی ، تیرۆر و ئاشتی و پێکەوەژیان و جارنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ).



ئەمانەکۆمەڵێك چەمك و دەستەواژەن لێرەو لەوی دەپرسن و پرسیارمان لی دەکرێ هەرکەس بە تەرازووی خۆی پێوانەوە کێشانەی دەکات ئەمەش جۆرێکە لەفەوزا نەك ئازادی تەئویل و نقلّ کردن، ئێمەش لە کۆمەڵگەی خۆمان تازە گەشتوینەتە ئەوەی ئایە؟ وێنە حەرامە یان گوێ گرتن لەگۆرانی، د. موستە فازەڵمی ئاماژە بەوەدەدات کەشەریعەت گۆڕانکاری بەسەر دادێت ئەوە دینە کەناگۆڕێت واتە (شەریعەت ودین ) زۆرجیاوازن.

فکری ئیسلامی پێویستی بە نوێکردنەوە هەیە لەڕوانگەی ڕوانییەنکانی بۆ ( ژیان و مەرگ و مرۆڤ بەگشتی و منداڵ و ئافرەت بەتایبەتی )، هەروەها چەمکی ( هاولاّتی بوون وفرەی سیاسی و پێکەوژیانی ئاینەکان...هیتد). لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە حیزبەئیسلامییەکان دەبێت بەڕوونی قسە لەسەر چەمکی دەسەلاّت و حوکمڕانی سەردەمیانە و پشتوانی کاری مەدەنی وخەباستی سیاسی بکەن بۆگەیشتن بە دەسەلاّت وەك ئەو قسەی (عادل باخەوان ) لەچاوپێکەوتنی لەگەڵکەناڵیکی ئیسلامی دا وتی گەر حیزبە ئیسلامییەکان دەیانەوێت سەرۆك وەزیرانێکیان هەبێت و بگەنە دەسەلاّتی بڕیاردن و دەوڵەت داری دەبێت خۆیان لە ( حیزبێکی ئاینی یەوە بگۆڕن بۆ حیزبێکی مەدەنی) بۆ ئەوەی چوارچێوەی کاری حیزبایەتیان فراوان بێت.

بیریاری ئیسلامی (مالك بن نبی) پێی وایە کەشارستانی ئیسلامی لەڕووی ئیسلامییەوە نەخۆشە ، ئستبدادی سیاسی و تاك ڕەوی مۆرکی سیستەمی حوکمڕانێتی دەوڵەتی خەلافەت بووە. هەروەها (د.هادی علی) باوەڕی وایە کەسیستەمی( خەلافەت) لەرشاستیدا ئەزمونێکی تواو مرۆڤانەیە و بەهیچ شێوەیەك بەشێك نییە لەئیسلام وەك دین، چونکە خەلافەت لەدوای کاملبوونی ئاین و ڕاوەستانی وەحی وەفاتی پێغەمبەروەیە(د.خ)، پەیدابووە. وەك مێژوونوسی ئیسلامی ( الشهرستانی) دەڵێت (گەورەترین ناکۆکی لەنێوان موسڵمانەکادا ڕوی داوە ناکۆکی بووە لەسەر دەسەلاّت، چونکە لەدوای هاتنی ئاینی ئیسلامەوە ئەوەندەی کەشمشێر لەسەر مەسەلەی دەسەلاّت بەکارهێنراوە لەسەر هیچ ڕێسایەکی ئاینی بەکار نەهێنراوە لەگشت سەردەمەکاندا ).

کەواتە قسەی ( ئیقبالی لاهوری) تەواو ڕاست دەردەچێت کەدەڵێت (ئەو بەهاو بنەماسیاسیانەی ئیسلام هێناویەتی بۆ ڕێکخستنی کاروباری حوکمڕانێتی لەمێژوی سیاسی موسوڵمانانندا هەر بەدەڵەمەی واتا (کامڵنەبوو) ماوەتەوە ونەخراوەتە دۆخی بەرجەستەی و بەدامەزراوەییەوە.

لەکۆتایدا دەمەوێت ئەو قسەی (عبدالرحمان کەواکبی ) بکەم کەئەوپێی وایە هەتا ( ڕیفۆرمی ئاینی نەکرێت ڕیفۆرمی سیاسی بەرهەمی نابێت)، وەپێویستە دێن لە وەهم و خورافە و ئەو هەزاران حەدیسەی کە بەناوی پێغەمبەروە (د.خ ) وتراوە کەهەمووی بۆ کۆیلەکردن و ژێردەستە بوونی موسڵمانان بووە بۆ

دەسەلاتدارنی ئومەوی وعەباسییەکان بۆئەوەی بەناوی خوا و پێغەمبەروە هەرچیان ویست لە خەڵکی بکەن و سەروەت وسامانی ولات بۆ خۆیان بەرن . کاتی ئەوەهاتووە کە گۆڕانکاری گەورە بکرێت لە نویکردنەوەی فکرو بۆچونی تازە بەرهەم بهێنرێت لەژیر ( ڕۆشنای قورئان و سونەتدا ) کەدڵنیام دەتوانیین زۆر شتی نویٚ بکەین و بگەینە ئامانجەکانمان بەمەرجێك گۆڕانکاری گەورە بکەین لەگوتارو بیرکردنەوەماندا.

بۆیە لێرەوە پێویستە حیزبەئیسلامییەکانی کوردستان سەرلەنوی گوتاری خۆیان ڕێك بخەنەوە کەلەگەلٚ دنیابینی نویٚ دا بگونجیٚ وەپاشان کاروکردوەکانی خۆیان بەهەنگاوی نویٚ و ئاڕاستەکراوداببەن لەخزمەتی هاونیشتیمانیان و هاولأتیاندابێت.

## ئایین و ئایینداریی (الدین والتدین)

لە پێناو تێکەڵنەکردنی ئایین و مێژوو، وەك دوو ئاست و بواری جیاواز، ئەم چەند جیاوازیە وەبیردێنمەوە:

١. ئایین: خوداییە (إلهی)، ئایینداریی مرۆییە (إنسانی)،
٢. ئایین: ڕەهایە (مطلق)، ئایینداریی: ڕێژەییە (نسبي)،
٣. ئایین: پیرۆزە (مقدس)، ئایینداریی پیرۆزنیە (غیر مقدس)،
٤. ئایین: ئاسمانیە (سماوی)، ئایینداریی زەمینیە ( أرضي)،
٥. ئایین: یەکێکە (واحد)، ئایینداریی فرەیە (متعدد).
٦. ئایین: گوتاری نبوەتە (القرآن والسنة)، ئایینداریی تێگەشتنی مرۆڤە (الفهم)،
٧. ئایین: مەبەستەکانە (المقاصد)، ئایینداریی میکانیزمەکانە (الآلیات)،
٨. ئایین: بەها باڵاکانە (القیم)، ئایینداریی ڕەفتارە (السلوك)،
٩. ئایین: بان مێژووییە (غیر تاریخی)، ئایینداریی مێژووییە (تاریخي)،
١٠. ئایین: نەگۆڕە (ثابت)، ئایینداریی گۆڕاوە (متغیر).

د. ئەنوەر محەمەد فەرەج



# لە تازەگەریەوە بۆ نوێکردنەوەی فکری ئیسلامی

## چەند سەرنج و پرسیارێکی بەرایی

ئەبوبەکر عەلی

چەمکی نوێکردنەوە و لەوانەش نوێکردنەوەی فکر و مەعریفەی ئیسلامی، هەر لە سەدەی نۆزدە و لەسەر دەستی گەورە ڕیفۆرمیشە موسڵمانەکانەوە، بووە بە بەشێ لە گوتاری بەشێ لە ناوەندە ئیسلامیەکەی کۆمەڵگا و، بەرامبەریش. بەڵام سەرەڕای ئەوە تاکو ئێستا ناتوانین بڵێین فکرێکی نوێی ئیسلامی کاریگەری وامان هەیە، بتوانێ ئەزمونی گەورەی شارستانی و سیاسی لەسەر بنیاد بنرێت. گەر چی لە ئێستادا هەست بە ژانی لەدایکبوونێکی نوێ لەو ڕووەوە دەکرێت. بەڵام ڕەنگەزانەکە بخایەنێت و ئازاریشی زۆر لەگەڵدا بێت. لێ زۆریشی دەوێت ئەوەی لەدایك دەبێت. شێواو نەبێت و نەبێتە بار بەسەر کۆمەڵگاوە و ئامارە نەبێت بە عەڵقەیەکی نوێ ی خۆدووبارەکردنەوە و درێژەدان بە ڕەوتی شێواوی خۆبنیادنانەوە.



هەموو ئەوەش دەیخاتە ڕوو، کە نوێ بوونەوەی فکری ئیسلامی پرۆسەیە، بەڵام پرۆسەیەکی پڕ گیر و گاز و هەڵکێش و داکێش. هەر چۆنێك بێت ئێمە بۆ ئەوەی باس لە فکری ئیسلامی نوێ و کاریگەر بکەین دەبێت لە تازەگەری (تجدید)ەوە بەرەو نوێگەری (تحدیپ) هەنگاو بنێین. چونکە (تجدید) بە تەنها و بەو جۆرەی لە ناوەندی فکری ئیسلامیدا دەبینرێت. ناتوانێت وەڵام بە پێداویستیەکانی دووبارە خۆبنیاکردنەوەی شارستانی بداتەوە، بە حوکمی ئەوەی توانای لەخۆگرتنی جیهانی نوێ و تێگەیشتنی لە ئاڵۆزی و تەحەداکانی وەك پێویست نیە .

وە لە ئاستێکی قوڵدا تێکەڵە بە بیرۆکەی تایبەتمەندێتی ( الحچوریە)، تازەگەری هێندەی بیرکردنەوەیە لە جیهانە دروستکراوە سنوردارەکەی خودی ئیسلامی و موسڵمانان، بەو ئەندازە





بیركردنەوە نیە لە جیهانی هاوبەش لەگەڵ ئەوانی دیدا، هێندەی تازەكردنەوەی كەرەسەكانی روانینە بە هەمان كەرەسە كۆنەكانی بەرهەمهێنانی مەعریفە و رێبازەكانی بیركردنەوە، بە هەمان شێوە، نوێكردنەوەی ئەو كەرەسە كۆنەكانی بەرهەمهێنانی مەعریفە و ئەو كەرەسانە و، بیركردنەوەیەكی بوێرانە نیە .

تازەگەری (تجدید) مامەڵەیەكی ئەندەكی (جزئی)یە لەگەڵ گۆڕاوەكاندا، كەمتر دەستپێدەبات بۆ (أصول) و بنەما و رێبازەكانی بیركردنەوە و ، گەڕانەوە بۆ دەق و بەرهەمهێنانی دید و چوارچێوەی بیركردنەوەی نوێ ی ئیسلامی وا، بتوانێت، نەترسانە بكەوێتە گفتوگۆیەكی فكری و شارستانیەوە.

(تجدید) لە فكری ئیسلامیدا ناتوانێت قەزا و ئاستی مەعریفی قۆناغی پێش مۆدێرنە تێپەڕێنێ، بەڵكو تا ئێستا نەیتوانیوە لەسەر ناوەڕۆكی خودی چەمكی تازەگەری (تجدید) بە واتا ئیسلامیەكەی رێكەوتن بكات. بەو واتایەی، ئەو تازەگەریەی لە دەقی فەرموودەیەكدا داوا كراوە بە ئەركی رێبەرانی فكری ئیسلامی، پێش ئەوەش قورئان لە دەیان ئایەتدا، كە



داوای تێفكرین و وەگەڕخستنی عەقڵ و تێڕامان و سەرنجدان دەكات، رەوایەتی پێ داوە، بە حوكمی ئەوەی تێفكرین و سەرنجدان لە كات و شوێن و چاخی جیاوازبە دەستەوە دەدات) تاكو ئێستا بە روونی دیار نیە لە چیدا بەرجەستە دەبێت و رەنگدەداتەوە و، خەسڵەتەكانی فكری تازە و كەس یاخود ناوەندی تازەگەری چین؟ ئەم پرۆسەیە ئاڕاستەی خودی ئاین دەكرێت، گەر وایە ئاڕاستەی كوێ ی ئاین دەكرێت؟ جیاوازی (دین) و (امری دین) چیە، بەو جۆرەی لە فەرموودەكەدا هاتووە؟ یاخود مەسەلەكە باس لە (دین) نیە و باسی لە تایپی دینداری و تێگەیشتن لە ئاین و فكر و مەعریفەی دینیە؟ وە ئەگەر مەسەلەكە بەم جۆرە بێت ئایە، بەبێ تازەگەری لە (أصول)ی (فقە) و رێباز و سەرچاوەكانی بەرهەمهێنانی مەعریفە و دەرباز بوون لە تەلەزگە فكریە مێژوویە بەسەرچووەكان و دەست بردن بۆ ئەو زانستە بنەماییانە، كە رەنگدانەوەی ئاستی مەعریفی سەردەمی تۆمار (تدوین) كردنیانن، دەتوانین باس لە تازەگەریەكی ڕاستەقینە بكەین .






هەر لەم ڕووەوە چەندان پرسی گرنگ شایستەی وروژاندنن، لەوانەش، ئایە لە تازەگەریدا ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ سەردەمی یەکەمی 0دەق) و خودی (دەق)ی دەمەزرێنەر و وەحی بێگەرد و ئەزموونە سەرەتاییەکانی تێگەیشتن و پیادەکردن، یاخود (دەق) لە ئێستادا ئامادە دەکەین و خوێندنەوەی نویێ ی بۆ دەکەین؟ یاخود هەنگاوی یەکەم وەك پێشمەرجی دەبێت بۆ دووەم؟ ئایە تازەگەری جارێکی تر گەڕانەوەیە بۆ (مقاصد) وەك ڕێبازێکی گەڕانەوە بۆ دەق، لە چوارچێوەی چەمکی شەریعەتدا، یاخود تێپەڕاندنیەتی بۆ دیاریکردنی (مقاصد) لەسەر ئاستی قورئان و ئیسلام خۆی؟ ئایە تازەگەری دەکاتە جیاکارێکی ڕوون و بوێرانەی نێوان شەریعەت (فقه) و ئیسلام، شەریعەت و پەیام ، روحی ئاین و (جزئیات)ەکانی؟ یان لە دیاریکردنی (پوابت)ەکانیدا لە سنوری ئیمان و عیبادەت و ئەخلاق و حەرام و حەڵاڵدا دەوەستێت و بەدەر لەوە کە دەکەوێتە بای (معاملات)ەوە بە ئەحکامی (محلل)دەزانین و هەر بەو جۆرەش مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین؟

مەبەست لە هەموو ئەو پرسیارانە و چەندینی تر ئەوەیە کە بیخەینە ڕوو، ناوەڕۆك و ئاماژەکردنەوەی فکری ئیسلامی تەم و مژی زۆری بەسەرەوەیە؟ هەر بۆیە ئەوەی لای هەندێ بە تازەگەری دادەزێت، لای هەندێکی تر بە لادان لە (ئاین) لە قەڵەم دەدرێت، ڕەنگە لای هەندێکی تر ڕوپۆشکردنی کەلەپور بێت بە هەندێ ڕووکەشی نوێ. هەموو ئەمە لە کاتێکدا ئێمە لە قۆناغێکدا دەژین، جیهان گۆڕانێکی گەورە و ڕیشەیی بەسەردا هاتووە، ئاڵ و گۆڕ بەسەر پێگە و وەزیفەی ئایندا هاتووە، پێویستی و چاوەڕوانیە روحی و دەروونی و ئەخلاقی و سیاسیەکانی مرۆژیش دیسانەوە گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. بەجۆرێك تازەگەری لە پێشکەوتووترین ناوەڕۆکی خۆیدا ناتوانێت وەڵام بە تەواوی ئەو چاوەڕوانی و پێداویستیانە بداتەوە و دەبێت فکری ئیسلامی



هاوچەرخ پێ بنێتە قۆناغی نوێگەریەوە، بۆ ئەوەی لە جیهانی نوێدا چوارچێوە و شکڵ و ناسنامە و ناوەڕۆك بە چەمك و پێدراو و دۆخ و دەزگا و دەستەبەری و نمونەکان بدات.

بەشێ لەوەش جۆرێ لە دووبارە دارِشتنەوەی پەیوەندی (دین) و (دنیا)ی دەوێت لە جیهانی نوێدا. دەستپێکردنە لەو قۆناغەوە کە سستەمی سیاسی ئیسلامی دیاریکراومان نیە، کە ئەرکی ئاینی ئێمە بێت، بەڵکو ئەوەی لەم ڕووەوە هەمانە ڕێودانگ و پێوەری ئەخلاقی ئاڕاستەکەر و ڕێنیشاندەرە.

بە واتایەکی تر ئێمە لە ڕووێکی فکری ئیسلامیدا ئەوەی پەیوەستە بە چەسپاوەکانی ئاین و ئیمان، ئەخلاق، عیبادەت، حەرام و حەڵاڵ پێویستمان بە دووبارە (تکیف) کردنەوە و ڕواندنەوە و کاراکردنەوە و وەزیفە پێدان هەیە، لە چوارچێوەی مرۆڤ و هەل و مەرجە نوێکان و ئەو ئاڵۆزیانەی ژیانی هاوچەرخ بۆ مرۆڤ و لەوانەش مرۆڤی باوەڕداری دروستکردووە. لە ڕووەکی ترەوە و ئەوەی پەیوەستەبەبینا کردنەوەی شارستانی و سیستەمی سیاسی و ئابووری و دامەزراوەکان هەیە، دەبێت فکری ئیسلامی بە ڕەچاوکردنی پێوەرە ئەخلاقیە ئیسلامیەکان و پێویستیەکانی بە ژینگەیی کردنی چەمك و ئەزموونەکان، نوێ بکرێتەوە. بەو واتایەی ئەم فکرە لە داوبەندی شمولیەتی ئیسلامی نوێ ڕزگاری ببێت و، لە ئاسۆیەکی گەردوونیانەی ئیسلامیەوە، بیر لە شارستانیەت و بە یەکداچوونە فەرهەنگیەکان و، هاوبەشەکانی مرۆڤایەتی و چارەنووسەکەی بکات. سەرقاڵی بە ئیسلامی کردنی چەمکە نوێکان نەبێت بەو جۆرەی بە ناوی تازەگەریەوەی لە چوارچێوەی بیری (احیاو)ی ئیسلامی سەدەی ڕابردوودا سەرقاڵی بوو. بەڵکو فکری ئیسلامی خۆی نوێ بکرێتەوە بەمەش تازەگەری ئیسلامی لە پەیوەندی بە داهێنانی تایپی دینداری نوێ، لەگەڵ نوێکردنەوەی فکر و لە خۆگرتنی ڕووە مرۆڤایەتیە هاوبەشەکەی مۆدێرنە و پرۆژەی دەوڵەتی نوێ و، بوون بە بەشێکی دانەبڕاوی شارستانێتی نوێ و، هەوڵدان بۆ ڕیفۆرمکردنی لە ناوە و دوای بوون بە بەشێ لێ ی یەکتر تەواوکەن. بەمەش دەرگای داهێنان و نوێبوونەوە و دەستپێشخەری ڕاستەقینە بە ڕووی ئەم فکرە و میللەتانی موسڵماندا بکرێتەوە.





## دیداری



## لەگەڵ

# ڕێبوار سیوەیلی:
# ئایینداریی بۆتە نومایشێکی دەرەکی و لە ئەزموونی ناخەکیی دینەکە بەتاڵ بۆتەوە.

**# ئەوانەی بە ناوی عەلمانییەتەوە دین بە داعش دەکەن، سیکۆلار نین.**

**# حزبە ئیسلامییە کان وەرەقەی ئیسلامیبوون لە دەستیاندا سووتاوە.**

**#دین لەزۆربەی کۆمەڵگاکاندا ئەوەندە خودگەرابۆتەوە هیچ ئەرکێکی کۆمەڵایەتی نەماوە.**

**ئامادەکردنی گفتوگۆ: وریاباقر**

چاوپێکەوتنی ئەم جارەی گۆڤارەکەمان باسی گرنگی ئاین لەکۆمەڵگادەکەین، بۆئەو مەبەستە پێمان باش بوو لەگەڵ بەڕێز (د. ڕێبوار سیوەیلی ) دا ، ئەم چاوپێکەوتنە ئەنجام بدەین لەبەرئەوەی بەڕێزیان یەکێکە لەڕۆشنبیرەناسراوەکانی کوردستان و مامۆستای زانکۆی سەلاحەدین و هەروەها پسپۆڕییەکەشی لە (کۆمەڵناسی) دایە کەپەیوەندی بەچاوپێکەوتنەکەی ئێمەوە هەیە. بەڕێزیشیان بەوە پەڕی خۆشحاڵییەوە وەلامی پرسیارەکانی ئێمەی دایەوە سەرەڕای جیاوازی بیرو بۆچونمان ، کەئەمەش مایەی خۆشحالی ئێمەبووە، کەدەبێتەهۆی نزیکردنەوەی ئەوئاڕاستەەجیاوازانە.



**گۆڤاری ڕوون : بەهۆی ئەوەی زۆربەی مرۆڤەکان لەکۆمەڵگەدا پابەندن بەئاینێکی دیاریکراو یاخود سروتێکی ئاینی دیاریکراوەوە، کەواتە وەزیفەی ئاین لەکۆمەڵگەدا چییە؟ بەتایبەتی ئاینی ئیسلام.**

ڕێبوار سیوەیلی: پێش ئەوەی من وەڵامی هەر پرسیارێک بدەمەوە دەمەوێ جیاکارەیەک بکەم لە نێوان دین و ئایین. بە بڕوای من دین بنەڕەتیی ئایین و ئەو پرانسیپانەیە کە دینەکانیان لەسەر بەندە. بەڵام ئایین بریتیە لە ڕێوڕەسم و بۆنە و نومایش و چالاکییە دینییەکان کە دەستەیەک لە باوەڕدارانی دینەکان لە کات و شوێنی تایبەتدا جێبەجێیان دەکەن بۆ ئەوەی لە ڕێگەیانەوە وابەستەیی خۆیان و تا ئەندازەیەک یەکگرتوویی خۆیان لە ئاست و بۆ دینێکی تایبەت نوێ بکەنەوە. لەبەر ئەوە دین بەلای منەوە پەیوەندییەکی تایبەت و بێنمونەی مرۆڤە بە بنەماکانەوە و ئایینەکان ڕەفتاری کۆگەرایی و ئاپۆرەیین، کە چاولێکەری و ڕەهەندی نومایشیانە تیایاندا باڵادەستە. بەم پێیەش بەلای منەوە مرۆڤی دیندار مەرج نیە هەمان مرۆڤی ئاییندار بێت و هەموو مرۆڤێکی ئاییندارێش بەوەی کە بەشداریی لە مەراسیمەکاندا دەکات، مەرج نیە دیندار بێت.

بۆ ئەوەی بێمەوە سەر پرسیارەکەت: ئەم پرسیارە بۆخۆی پرسیاری کۆمەڵگایەکە کە گریمانەی بوونی ئایین وەک جۆرێک لە دڵنیایی وێنا دەکات و لە دین جیای دەکاتەوە، یان هیچ جیاوازییەک لە نێوانیاندا ناکات. بە مانایەکی دی، ئەم پرسیارە ئەوەش ئاشکرا دەکات کە لەناو کولتور و زەینییەتێکەوە هاتۆتە دەر، کە پێیوایە دەبێت لە زۆرینەی کۆمەڵگایەکدا دین و ئایین هەبێت. من بۆخۆم پێموایە مەرج نیە دین و ئایین لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا هەبن بەو جۆرەی کە ئێمە لێی تێگەیشتووین. دین لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا ئەوەندە سۆبژەکتیڤە و خودگەرا بۆتەوە، بە هیچ شێوەیەک هیچ ئەرکێکی کۆمەڵایەتی نەماوە، لە هەمان کاتیشدا ئایین و مەراسیمە دینیەکان گۆڕانی تەواویان بەسەردا هاتووە و لە هەندێ کۆمەڵگادا تەواو کاڵبوونەتەوە و لە هەندێ کۆمەڵگاشدا پەیوەندییەکی



ئەوتۆیان بە دینەوە نەماوە. تۆ تەماشای كەنیسە بكە لە وڵاتانی سكەندناڤی كە چۆن بۆتە شوێنی جێبەجێكردنی هەندێ مەراسیمی ئایینی وەک مەراسیمی ناونان و پاككژكردنەوە و باڵقبوون و هاوسەرگیری و هتد. كە هەرچەندە ئەمانە پەیوەندییەكان بە بۆچوونی دینێك لە دینەكانەوە هەیە، بەڵام ئەم ئایینانە گوزارش لە دۆخێكی دیندارانە ناكەن ئەوەندەی گوزارشتن لە دۆخێكی كۆمەڵایەتیی خووپێوەگرتووی كۆمەڵایەتی. بە هەمان شێوەش، چیتر مزگەوت و ئەو مەراسیمانەی لەوێ جێبەجێدەكرێن گوزارش نین لە دۆخێكی باوەڕدارانە بە بنەماكانی دینی ئیسلام ئەوەندەی نومایشێكی جەماوەرین بۆ بەهێزكردنی هەستی (ئێمە) لە ئاست (ئەوانیتر)دا. هەردوو شوێنەكە، كەنیسە و مزگەوت بوونەتە شوێنی جێبەجێكردنی ئایین و مەراسیمەكان، بەڵام ڕەهەندی دیندارانەیان كاڵبۆتەوە: ئەمەش پێماندەڵێت، دین لە كۆمەڵگادا ئەركێكی ئەوتۆی نەماوە و بووە بەبەشێكی لە ژیانی تاكەكان، بەڵام ئایین ڕۆڵێكی تەواو كۆمەڵایەتی هەیە و پەیوەندیی بە دینەوە نەماوە.

ئەگەر بێت و لێرەوە قسە لەسەر ڕۆڵی دینی ئیسلام لەم كۆمەڵگایەی خۆماندا بكەین، وەڵامەكەی من ئاوای لێدێت: دینی ئیسلام ئەمڕۆ لە ناو و بەهۆی پرانسیپە نەگۆڕەكانی خۆیەوە لە كۆمەڵگادا ئامادەیی نیە، ئەوەندەی بە هۆی نوێنەرایەتیكردنەكانییەوە خۆی مانیڤێست دەكات، ئەم نوێنەرانەش ئەوەندە زۆر و لە ناوخۆییاندا ناكۆكن، ناتوانن ببنە گوزارشێكی ڕاستەقینەی باوەڕپێكراو بۆ بنەمای دینەكە. نوێنەرانی ئەم دینە لە ئەمڕۆدا، بەسەر چەندین لق و دەستە و گرووپدا دابەشبوون و لە ناو خۆیاندا نە یەكگرتوویی، نە هاوشوناسی و نە هاوئایینی هەیە. جگە لە دابەشبوونە مەزهەبییەكەی ئەم دینە بەسەر سوننە و شیعەدا و جگە لە دابەشبوونە جوگرافییەكەی بەسەر سعودیە و ئێراندا و جگە لە جیاوازییە كولتوورییەكانی نێوان بەشەكانی ئەم ئایینەدا لە شوینە جیاوازەكانی وەک مالیزیا و ئەمەریكا. لەلای خۆشمان جیاوازییەكی زۆر كەوتۆتە نێوان بۆچوونی مەلاكانی جاران و سەلەفیەكانی ئێستا، لە نێوان مەلاكانی هەولێر و سلێمانی و لە نێوان یەكێتی زانایان و ئەوانیتر و سەلەفییەكان.. ئەم چل پارچەبوونە ناتوانێت بگەڕێتەوە سەر بنەماكان و هەر نوێنەرە لە لێكدانەوەی خۆیەوە بۆ ڕستە و گوزراشە دینیەكان لە قورئان و فەرموودەدا، تەفسیری



خۆی لەم دینە دەکات و بەهۆی ئایینێکی تایبەتەوە گوزارشی لێدەکات.. بۆیە لە ئەمڕۆدا هەم داعش و هەم بزووتنەوەی ڕۆحیگەرییش شەرعییەتی خۆیان لە هەمان دینەوە بەدەستدەهێنن، بەڵام هاوشوناس نین.. ئەمەش پێمادەڵێت: ئەم دینە ناتوانێت وەک جاران و وەک بەشێک لەو مێژووە چاکسازیگەرایی و پاکژباوەڕییەی لە کوردستاندا هەیبووە، ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، چونکە هەر لەلایەن هەڵگرانی بیروڕای هەمان دینەوە، دژایەتی دەکرێت. بۆیە ئەوەی کە بەناوی دینەوە هەیە و خۆی مانیڤێست دەکات، جگە لە فۆرمێکی ئایینی نومایشکارانەی حەماسی کە لە خۆیدا هەڵگری دژایەتییەکی دەروونی و دژایەتیە لە دژی ئەوانیتر، هیچ شتێکیتر نیە. ئەم فۆرمەش لە ئاییندارى هەتا دێت بنەماکانی دینەکە بچووک و تەسک دەکەنەوە و دین وەک سایکۆلۆژیا و میزاجیکی مرۆیی لێدیت نەک ویستێکی خودایی و مەلەکوتی..

**گۆڤاری ڕوون : ئەو قسەیەی (مارکس) کە دەڵێت: (ئاین تلیاکی گەلانە) (الدين افيون الشعوب)، ئایا مەبەستی لێی ئەوەیە کە کۆمەڵگە دەخاتە چوارچێوەیەکی سنوردارەوە کەناتوانێت گوزارشت لەمرۆڤبوونی خۆی بکات بەڕەهایی؟ یان مرۆڤی نەخۆش بەرهەم دەهێنێت؟ هەرخودی ئەم قسەیە ئەوە ناگەیەنێت کە مارکس خۆی لەژێر فشاری ئایندا ئەم قسەیەی کردووە؟ واتە دەتوانین بڵێن ئاین زەرورەتی هەموکۆمەڵگەیەکە؟**

ڕێبوار سیوەیلی: زۆر سوپاس کە دەتەوێ مەبەستەکە تێبگەیت، منیش بەپێی تێگەیشتنی خۆم، کە سنووردارە لەم بوارەدا ئەوەت بۆ ڕووندەکەمەوە. مارکس ئەم ڕستەیەی لە پێشەکی (ڕەخنە لە فەلسەفەی ماف لای هیگڵ 1843)، نوسیوە و پێویستە لەو پێشزەمینەیەوە لەم ڕستەیە تێبگەین کە مارکس وەک فەیلەسووفێک تیایدا بیری کردۆتەوە. یەکێک لەو ڕەخنانەی لەم بیرمەندە دەگیرێت ئەوەیە، کە پچڕ پچڕ و لێرەولەوێ بیروڕای خۆی لەسەر دین دەربڕیوە. مارکس دینی بە ئامرازی دەستی دەسەڵاتداران زانیوە کە بەکاریانهێناوە بۆ پەردەپۆشکردن و شاردنەوەی هۆکارە ڕاستەقینەکان و سەرچاوەکانی چەوساندنەوە و دوورخستنەوەی خەڵک لە تێگەیشتنیان هەلومەرجە ناخۆشەکانی ژیانیان. بەمجۆرەش بۆ مارکس لەوەها هەلومەرجێکدا





کە دەسەڵاتداران مرۆڤی پێوە گیرۆدە دەکەن بۆ هێشتنەوەی بەرژەوەندیی خۆیان، (دین ئەفیونی گەلانە) چونکە بەشێوەکی خێرا ئەو ئازارە بیر دەباتەوە کە خەڵک هەستی پێدەکەن بەبێ ئەوەی بنەبڕی بکات. لە هەمان کاتیشدا دین، ئەو خەون و خەیاڵانە بە مرۆڤ دەبەخشێت کە وا بیر لە ژیانێکی باشتر لە بەهەشت بکاتەوە و بەمهۆیەشەوە، تەرکیزی لەسەر ژیانە دەردەدارانەکەی خۆی لەسەر زەوی نەمێنێت. لێرەوە بۆ مارکس، دین دەبێتە شێوازێکی ڕاکردن لە واقیع کە بەهۆیەوە لە جیاتی ئەوەی مرۆڤ جەخت لەسەر گۆڕینی هەلومەرجە خراپەکانی ژیانی سەر زەوی بکاتەوە، خەون و فەنتازیا لە ژیانێکی خۆشی بەهەشتیانەوە دەبینێت. ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە تەماشای گوتەکەی مارکسمان کرد، دەبێت دەستهەڵگرین لەو تۆمەتبارکردنە پێشوەختەی لە ئەدەبیاتی دژەمارکسیانەی جیهانی سێیەم و بەتایبەتیش ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا ئاراستەی مارکس دەکرێت. هەر لە ژێر کاریگەریی ئەم تێگەیشتنە ڕواڵەتگەرایانەیەشدا ئاراستە ئایینیەکانی ئەم ناوچەیە، بەبێ قووڵبوونەوە و بەدەستهێنانی تێگەیشتنێکی ورد لە بیروڕای مارکس لەسەر دین و بەستنەوەی ئەو تێگەیشتنە بە هزری مارکس و ئەو هەلومەرجەی ئەوی تێدا دەژیا، هاتن و ئەم ڕستەیەیان لە سیاقی سۆسیۆلۆژیانەی خۆی دەرهێنا و کردیانە دروشمی دژە مارکسیانەی خۆیان.

بۆیە تێگەیشتنی ئیسلامگەرایی لە بۆچوونی مارکس تێگەشتنێکی دەستی دووەم و دووبارەکردنەوەی هەمان تێگەیشتنە لە چەپگەرایی تەقلیدی کە ئەو بۆچوونەوەی مارکسیان وەک بەڵگەیەک لەسەر دژایەتی ئەو فەیلەسووفە مەزنە بۆ دین، خستەڕوو. لە کاتێکدا تێگەیشتنی مارکس لە دین و ئایینەکان، پەیوەندییەکی قووڵی هەیە بە شێوازیی ئەوەوە لە شرۆڤەکردنی چینایەتیانەی کۆمەڵگادا.

بۆیە ئەوە ڕاستە مارکس ئەم وتەیەی لە ژێر گوشاری ئاییندا کردووە و ئەوە دەردەخات کە ئایین وەک دیاردەیەک لە ژیانی مرۆیەکاندا ئامرازێکە بە دەستی ئەوانەی بەرژەوەندییان لە چەوساندنەوەی مرۆڤ و هێشتنەوەی دۆخی هەنووکەدا هەیە و مرۆڤیان مەحکوم کردووە بەوەی ئازار و جەورێک بکێشێت کە ڕەوا نیە. مارکس بەم مانایە دژی ئایینە و هیچ لەسەر دین نەگوتووە. ئەو دژی ئایینە چونکە ئایین ئەو ڕۆڵە دەگێڕێت کە مرۆڤ بێ ئیرادە بکات لە ئاست



گۆڕینی هەلومەرجەکانی ژیانییدا کە سەرچاوەی جەور و نەهامەتیەکانین. ئەو لەسەر تیۆرە و تێز و پرانسیپی دین قسەی نەکردووە بەڵکو قسەکەی لەسەر بنەمای ئایین وەک دەرکەوتەیەکی کۆمەڵایەتیەوە کردووە.
بۆیە ئەگەر بەشی دوایی پرسیارەکەت لەم ڕوانگە و تێگەیشتنەوە وەڵام بدەمەوە، دەبێت بڵێم: ئایین وەک دەرکەوتەیەکی کۆمەڵایەتی و وەکئەوەی تەفسیر و تێگەیشتنی مرۆیەکانە لە بنەما دینیەکان و جێکردنەوەی میزاج و هەست و تێگەیشتنی خۆیانە لە ئایینەکانی هەر دینێکدا و ئەو هەموو ناکۆکیی و دژایەتیەی لێدەکەوێتەوە کە لە ئێستادا و لە کۆمەڵگا ئایینییەکاندا دەیبینین، ئەوە بەم مانایە ئایین زەروورەتێک نیە بۆ هیچ کۆمەڵگایەک و نابێت ببیتە سەرچاوەی ناخۆشی و ئازار بۆ مرۆڤ، چونکە ئەمە لەگەڵ بنەما و پرانسیپی دیندا یەکناگرێتەوە.

**گۆڤاری ڕوون : عبدالکریم سروش، بیریاری ئیسلامی، لەکتێبی (ئازادی و عەقل) دا، پێی وایە کە ئاین دوو ڕۆڵی هەیە یەکەمیان جیهانی دەرەوە لەسەر شێوازی سیستەمی کۆمەڵایەتی و مەدەنییەکان، دووەمیش جیهانی ناوەوەی مرۆڤ خۆیەتی کەئەمەش لەئاینی ئیسلامدا دەردەکەوێت. ئەوبڕوای وایە کە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان و شارستانییەکان بەبێ ئامادەبوونی ئەزموونی ئاینی وەک جەستەیەکی بێ ڕۆح وایە، بۆچوونی بەڕێزت لەوبارەیەوە؟**

ڕێبوار سیوەیلی: لەگەڵ هەندێ بەشی قسەکەی پرۆفیسۆر سرووشدا هەم: دینەکان ئەو دوو دیوەیان هەیە کە کاریگەریی و ڕۆڵی ئەوان لە دنیای دەرەکی و دنیای ناخەکیدا بەدیار دەخات. بەڵام بە بڕوای من دین و ئایین لێرەشدا لێکتر جیا دەبنەوە. ئەو کاتەی دین دەبێتە ڕێکخەری ژیانی کۆمەڵایەتی و دەستدەخاتە ناو ژیانی مرۆییەوە، لە دینێتیەوە دەبێتە ئایین و دەچێتە چوارچێوەی تەفسیر و تێگەیشتنی هاوکاتیانەی مرۆڤەکان و لێرەشەوە میزاج و دۆخی مرۆڤبوون خۆی دەخاتە بری پەیامی یەزدانی و دین لە دینێتی دەخات و دەیکاتە ئایینێکی بابەتگەرا. بەڵام دین هەمیشە خۆگەرایە و شوێن و پێگەی ئەو لە ناخدایە. ساتەوەختی سرووش، ئەمە دەردەخات کە پەیامبەریش تووشی دەهشە دەبێت..





میراتی عیرفانی و تەسەووف بەڵگەیە لەسەر ئەم تێگەیشتنە لە دین لە نوسخە مرۆییەکەیدا. ئەوەش ڕاستە کە دینی ئیسلام لەم ڕووەوە میراتێکی دەوڵەمەندی هەیە، بەڵام ئەم دەوڵەمەندییە تەنیا تایبەت نیە بەم دینە و هەموو دینە تاک خودایی و فرەخودا و بێ خوداکانیش خاوەنی هەمان میراتی دەوڵەمەندی کاریگەریی خۆیانن لەسەر ناخی مرۆڤ.. بۆیە ئەگەر لە جیهانی ئیسلامێتیدا و لە ڕۆژگاری ئێمەدا وا دەردەکەوێت کە دینی ئیسلام بەبێ ئەزموونی دیندارانە، وەک جەستەیەکی بێ ڕۆح وایە، بە مانای ئەوەیە لەم ڕۆژگارەدا پتر لە هەر سەردەمێک، ئایینەکە لە دینەکەی دابڕاوە و ئاییندارییی بۆتە نومایشێکی دەرەکی و لە ئەزموونی ناخەکیی دینەکە بەتاڵ بۆتەوە. ئەمە ئەو مانایەیە من لە قسەکەی دکتۆر سرووشەوە وەریدەگرم. ئەزموونی دینی لێرەدا پتر ڕەهەندە ڕۆحیی و مەعنەوییەکەی دین دەگرێتەوە نەک ڕەهەندە بازاڕیی و نومایشی و ڕواڵەتییەکەی ئایینەکان..

***گۆڤاری ڕوون : ئایا ڕاستە کە ئاینەکان (زادە – بەرهەم)ی کۆمەڵگەکانی خۆیانن واتە ئاین پەیوەستە بەڕادەی پێشکەوتن یان پاشکەوتنی هەرکۆمەڵگەیەک؟ بۆئەوەی پرسیارەکەم ڕونتر بکەمەوە، بۆ نمونە ئەزموونی کۆمەڵگەی تورکی جیاوازە لەئەزمونی کۆمەڵگەی ئەفغانی یان ئەزمونی عەرەبی جیاوازە لەئەزموونی ئیسلامی لەئەوروپا، یاخود هەرئایینێک سیفەتی گشتگیریی خۆی هەیەو لەناوچە جیاوازەکان بەهەمان شێوە پەیڕەویی لێ ئەکرێت؟ ئەگەر جیاوازە هۆکاری جیاوازییەکە بۆچی دەگەڕێتەوە؟***

ڕێبوار سیوەیلی: دەزانیت ئەم پرسیارە لە بنەمادا مارکسیانەیە تا ئیسلامیانە؟ لەگەڵ ئەوەشدا شایانی ئەوەیە بە وردیی لێی بڕوانین. من بڕوام وایە ئایینەکان، نەک دین، بەشێکن لەسەرخانی کۆمەڵایەتی و وەک ئایدیۆلۆژیا و کولتوور بەرهەمهاتووی ژێرخانێکی سیاسی و ئابووریی و کۆمەڵایەتین. بۆیە ئەو جیاوازییەی لە نێوان ئایینەکان لە ئاست یەکتر و ئەو جیاوازییەی لە نێوان قۆناغە جیاوازەکانی هەر ئایینێکدا دەبینێرێتەوە، پەیوەندیی بەو هەلومەرجانەوە هەیە کە لە کۆمەڵگادا لەبارن بۆ گەشە و پاشەکشەی ئایینەکان. خۆ



مانیڤێستكردنی هەر ئایینێك لە شوێنێكی جیاواز، پەیوەندیی بەو هەلومەرجە باڵادەستانەوە هەیە كە لەو شوێنەدا دەستنیشانی كولتوور و ئایین و ئایدیۆلۆژیای بەرهەمهاتوو دەكەن. مادامەكی ئایین لە ڕێگەی مرۆڤەكانەوە خۆی بەیان دەكات و لەبەر ئەوەی ئەزموونی دینیی سەبژەكتیڤ و خودییە و خۆی لە شێوەی ئاپۆرەییدا بەدیار ناخات، ئەوە ئایینیش دەبێتە ئەو دەفرەی كە تیایدا پتر مرۆڤ و دۆخەكانی دەبینینەوە، نەك خودا و ڕۆحییگەریی و ئەو مرۆڤانەی بە ئەزموونی دینیدا تێپەڕیون. هەر شتێك، هەر بیروڕایەك ئاپۆرەیی بۆوە و بابەتیانە خۆی مانیڤێست كرد، دەبێتە ڕەنگدانەوەی بۆچوونی مرۆڤ و بەشداریی دەكات لە چڕكردنەوە و كاڵكردنەوەی كێشە مرۆییەكان، بەمەش هیدی هێدی پەیوەندیی بە دینەوە نامێنێت و دەبێتە سیاسەت و ئایدۆلۆژیا..

ئەگەر دین لە كۆمەڵگا مرۆییە جیاوازەكاندا لەسەر بنەمای سیفەتە گشتگیرەكانی خۆیەوە، ئامادەیی دەبوو، نەك وەكئەوەی دەبێتە ڕەنگدانەوەی زیهن و میزاج و بیركردنەوەی سنووردارانەی مرۆیی، ئەوە دەبوو لە ئێستادا ئایینەكان هەڵگری هەمان بنەمای دینەكەیان بوونایە لە هەر شوێنێك.

لە مێژووشدا هەر وابووە و شوێن و كات كاریگەریی خۆیان بەسەر دەركەوتەی ئایینەكانەوە هەبووە. ئیسلام لە ئەندەلووس، هەمان ئیسلام نەبووە لە بەغدا و كوفە و بەسرە و وڵاتی شام. ئیسلامی ئێستای داعشیش زۆر دوورە لە ئیسلامی ئیبن عەرەبی و حەلاج و مەولەوی.. بۆیە ئەگەر ئیسلامی توركیا جیاوازە لە ئیسلامی عەرەبی و ئەگەر لە هەر وڵاتێكی عەرەبییدا چەندین ئاراستەی جیاوازی ئیسلامێتی خۆیان بەرجەستە دەكەن و ئەگەر هیچ دوو وڵاتی عەرەبی نیە یەك دین بن و ئەگەر ئیسلامی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی جیاوازە لە ئیسلامی ئەمەریكی و ئەورووپی و ئەگەر مسوڵمانبوونی كورد جیاوازە لە جیهادییە مسوڵمانەكان و ئەگەر ئیسلامێتی مەولانا خالید و مودەڕیس لە ئیسلامێتی باپیر و مەلا كرێكار و سەلەفییەكان، جیاوازە و هتد، هەموو دەگەڕێتەوە بۆ دابڕانی نێوان دین و ئایین و دووركەوتنەوەی مسوڵمان لە ئەزموونی دینی و تەسلیمبوون بە ئایینە فرە چەشنەكانی خۆنمایشكردنی ڕواڵەتیانەی بازاڕویست..



***گۆڤاری ڕوون : بەهۆی ئەوەی خودی ئاین بەگشتی هەڵگری پەیامی (میانڕەویی، لێبوردەیی، ئاشتی، پێکەوە ژیان...)ە، تاچەند پێویستە ئەم خاسیەتانە لە ئاینخوازان و بانگەشەکارانی ئایندا هەبێت تا لەڕێگەی ئەم چینەوە لەچین و توێژەکانی دیکەشدا بەکردەوە ڕەنگ بداتەوە؟***

ڕێبوار سیوەیلی: هیچ دینێک لە دەرەوەی قەیدی شوێن و کات نیە، بۆیە چ دینە مێژووییەکان و چ دینە سرووشییەکان، زیاد لە ڕەهەند و ڕوویەکیان هەیە و لە ڕەوتی بەرەوپێشچوونی خۆیاندا پەیامەکانیشیان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە تا وەڵامدەرەوەی بەشدارییان بێت لە چارەسەر و لایەنگیری کێشە مرۆییەکاندا. دەبێت پەیامی توندڕەوبوونی دینەکان یان پەیامی لێبووردەخوازیان لەم ڕوانگەیەوە هەڵسەنگێنین و لێبووردەیی و توندڕەوخوازیی سیفەتی نەگۆڕی دینەکان نین، بەڵام توندڕەوی و لێبووردەیی دوو ئاستی ڕۆشنبیریی مرۆڤن. ئەوە مرۆڤەکانن ڕۆحی



توندڕەوی و لێبووردەخوازیی لە دینەکەیاندا بەرجەستە دەکەن و هەر ئەوانیشن کە دینەکان دەکەنە ئایینی یەکێک لەم دوو سیفەتە و ئەوانیتریش..

دین لە خۆیدا وەک دیاردەیەک، هیچ هەڵوێستێکی لە واقیعێکی تایبەت نیە، ئەو هەیە ببێتە ئەزموونی مرۆیی و بەشدار بێت لە بەخشینی شوناسدا بە مرۆڤ.. بۆیە ئەوە مرۆڤە بڕیار دەدات لەگەڵ کامە ڕەهەندی دیندا مامەڵە بکات: لەگەڵ دیندا وەک ئەزموونێکی خودی و سۆبژەکتیڤانە، یان لەگەڵ ئایینیی دیندا وەک مەراسیمێکی نومایشیانە؟ ئەوەی من دەیبینم ئەوەیە کە لە ئێستادا و لە ئاستی زۆرینەی ئایینەکان و بەتایبەتی ئایینداریی ئیسلامیانەدا، دین لە پاشەکشەدایە و میزاجی مرۆیی بەسەر سرووش و پەیامی خودائییدا باڵادەستە، بەڵام ئایین لە فۆرمە توندڕەخوازیی و متبوونە سەلەفیانەکەی و سیاسیە یەکگرتوویی و



کۆمەڵییەکەی و عامییگەرابییەکەیدا، لە برەودایە.. بۆیە ئەو کێبەڕکێ و ململانێ و پێکدانان و تۆران و ئاشتبوونەوانەی پەیڕەوکارانی ئایینەکان لەگەڵ یەکتر و ئەوانیتردا دەیکەن، ڕەنگدانەوەی میزاجی مرۆییە نەک ئەزموونێکی دیندارانە. ئەوە دەنگی دینەکان نیە لەسەر شەقەمەکان و میدیا و مزگەوت و دەیر و کەنیسەکان و پەرستگاکانەوە بەرز دەبێتەوە و ژیان لە مرۆڤ حەڵاڵ و حەرام دەکەن، ئەوە تەفسیرێکی مرۆیی میزاجیانەی پابەند بە قەیدی شوێنکاتەوەیە، کە ئەو جۆرە ڕوانگەیە بۆ ژیان بەناوی دینەوە نوێنەرایەتی دەکات.

**گۆڤاری ڕوون : هێزە ئیسلامییەکان لەکوردستان تاچەند ڕۆڵیان هەبووە لەهۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگەکەیان؟ یان ڕادەی هۆشیاریی و هەڵوێستی ئەوانیش زادەی کۆمەڵگەکەی خۆیانە یاخود تەنانەت کۆمەڵگەی عەرەبیی ڕابردووە؟**

ڕێبوار سیوەیلی: هێزە ئیسلامیەکانی کوردستانیش لەو بۆچوونە بەدەر نین، کە لەو وەڵامی پێشوودا بەرجەستەم کرد. من لە پێگەی داوەرییکرنیاندا نیم و تەنیا بیروبۆچوونی خۆم دەڵێم. ئەوانە هێندەی بەلای پۆپۆلیزم و عەوامگەرایی و بە ئاپۆرەکردنی ئاییندا ڕۆیشتوون ئەوەندە بەلای دینداریدا نەچوون. زۆرێک لەو ئایینانەی ئەوان بە ناوی دینەوە ڕەواجیان پێداوە، پەیوەندییان بە دینداریيەوە نیە. دینداری ڕێز لە ژیان و بوونی مرۆیی دەگرێت و لەدژی ئازادیی نیە، بەڵام ئاییندارێی ژیان لە مرۆڤ حەرام دەکات و دەیکاتە گوناهبارێکی هەمیشەیی. مرۆڤنۆڕیی دیندارانە مرۆڤ سەرمەشق و ئازاد دەکات لەوەی چۆن عیبادەت بکات، بەڵام ئاییندارێی نوێژ وەک عیبادەت دەخاتەڕوو، نەک عادەت.. بەودیوی تریشدا هیچ دابڕانێکی نەوعی لە تێڕوانین و لە خۆتێگەیشتنیاندا لە دین لە دەرەوەی تێگەیشتنە عەرەبی ئیسلامییەکە، ڕووینەداوە و پابەندبوونی ئەوان بەو ئاراستانەی ئیسلامی سیاسیی جیهانی عەرەبیيەوە، نەیتوانیوە نفوزی ئەوان لە یادوەریی کوردیدا کە بە ناوی عەرەبی ئیسلامییەوە بریندار کراوە، زیاد بکات و برینیان سارێژ بکات. جگە لەوەش ئەو هووشیاریەی ئەوان بڵاویان کردۆتەوە و دەیکەنەوە، هووشیارییەکی ئایینی، ئایدیۆلۆژیی سنووردارە و وەرگر تەنیا



هاوبیرەکانی خۆیانن نەک تەواوی کۆمەڵگا. خودی وشەی هووشیارکردنەوە لە ڕوانگەی ئیسلامییەکانی کوردستانەوە، مانایەکی دیکەی هەیە لەوەی من لە هووشیارکردنەوە تێدەگەم: ئەوان وا کار بۆ هووشارکردنەوە دەکەن، وەکئەوەی لەو بڕوایەدا بن کۆمەڵگا نەزانە بە ڕاستەقینەی دین و ئەوان دەتوانن ئەم کۆمەڵگایە بە ئیسلام ئاشنا بکەن. هووشاریی لەم تێگەیشتنەدا هووشیارکردنەوەی باوەڕدارانەی تاک و گرووپەکانە بە هەمان ناوەڕۆکی ئایینی، نەک بەرهەمهێنانی مانای نوێ و هاوچەرخانە لە دین بۆ تەواوی کۆمەڵگا. پاشانیش، ئەمە هووشاری نیە و گشتاندنی ئایینیە و بەکارهێنانێتی لە تۆڕێکی گەورەتری کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بۆ زیادکردنی نفوز و بەکارهێنانی لە ئاست گرووپە سیاسیەکانی بەرامبەریاندا. لەمەشدا مافی خۆیانە و هەر کەس سیاسەت بکات، ئەو شتانەش دەکات کە لە سیاسەتدا ڕێگەپێدراون. بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە، ئایا سیاسەت دینە، یان دین لە میانەی مەراسیمە ئایینیەکاندا سیاسیاوی دەکرێت؟ بۆچی پێویستە دین ئایینەکەی نەبێت و بۆچی ئایینەکانی دینێک گوزارش نین لە بنەمای دینەکە؟ هەمان خوێندنەوەکەی مارکس بۆ دین بەسەر ئەم حزبە سیاسیە ئیسلامیانەشدا پراکتیک دەکرێت: ئایین ئامرازی دەستی دەسەڵاتدارانە بۆ هێشتنەوەی دۆخی ئامادە و بەردەوامیدان بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەبێ ئەوەی توانای گۆڕینی هەلومەرجەکانیان هەبێت.. ئەمان بۆخۆیان جێگەی دەسەڵاتیان بەسەر دینەوە گرتۆتەوە و دینیان لە چێوەی ئایینەکاندا پەسەندە و بەکاریاندەهێنن بۆ زۆرکردنی ئەندامانی خۆیان بەبێ ئەوەی بتوانن گۆڕانێکی نەوعی لە هەلومەرجی ژیانیاندا بکەن.. بەمکارەشیان، بێگومان زیانێکی گەورەیان بە دینداریی ڕاستەقینە و بە ئەزموونی دیندارانەی مرۆڤ و بە ڕۆڵی دینیش لە کۆمەڵگادا گەیاندووە.. ئەمە ئەو شتەیە کە پێیدەگوترێ: ئاگایی درۆزنانە، یان هووشیاریی درۆزنانە و بە ئایدیۆلۆژیکردنی دین..

**گۆڤاری ڕوون : ئەو وێناکردنەی هەموو ئیسلام بە داعش و کوشتن و بڕین، وە وێناکردنی کەسی عەلمانی بەکافرو دۆزەخیی، وێناکردنێکی بێزراو و بەسەر**



**چوو نییە؟ نابێت لەچوار چێوەی ڕەفتارەکانیاندا خوێندنەوەیان بۆ بکەین؟ یاخود وێنای دروست بۆ ئەو چەمکانە لەسەر چ بنەماو پێوەرێک دەکرێت؟**

ڕێبوار سیوەیلی: لە ڕوانگەی منەوە، نە ئیسلام یەکسانە بە داعش، ئەویش لە نمونە مێژووییەکەی و هەنووکەییەکەیدا، نە تێگەیشتنی ئیسلامیانەش لە سێکۆلاریزم، هیچ زیانێک و زیادەیەک دەخاتە سەر سیکۆلاریزم. بە مانایەکی دیکە و لە ڕوانگەی سادەی منەوە: نە دینێکی داعشیانەمان هەیە، نە سێکۆلاریزمێک کە ئیسلامگەرایی بتوانێت پێناسەی بکات و لێی تێبگات. بە مانایەکی دیکە: هەموو ئەوانەی بە ناوی عەلمانییەتەوە دین بە داعش دەکەن، سێکۆلار نین و هەموو ئەوانەش بە ناوی ئایینەوە عەلمانیەت دەخەنە بری سێکۆلاریزم و بە شەیتان و کافری دەکەن، باش لێی تێنەگەیشتوون. هەروەک چۆن نەریتی چەپگەرایی تەقلیدی بە درێژایی سەد ساڵ زیاتر، ڕستەکەی مارکس: (دین تلیاکی گەلانە)ی وەک درووشمی مارکسیانەی دژە دین بەکار دەهێنا و هەروەک چۆنیش ئاییندارانیی جیهانی سێیەمی و خۆرهەڵاتناوەڕاستی هەمان ڕستەیان دەکرد و دەیکەنە بەڵگە لەسەر دژایەتی مارکس بۆ دین، ئاواش عەلمانیەکان دژایەتی ئایین و ئایینباوەڕان دژایەتی عەلمانیەتیان خستۆتە بری دین و سێکۆلاریزم.. کێشەکەش لەوەدایە ئێمە لەم کۆمەڵگایەی خۆماندا نە دینباوەڕ و دینداری ڕاستەقینە و نە سێکۆلاری ڕاستەقینەمان هەیە، و ئەوەش کە بەو ناوەوە و لەو سەنگەرانەوە ئاراستەی یەکتری دەکەن، پەیوەندیی بە دینداری و سێکۆلاریزمەوە نیە، ئەوەندەی پەیوەندیی بە میزاج و سایکۆلۆژیای مرۆییەوە هەیە. ئەم جیاکردنەوە و خستنەبرییە، تەنیا لە زەین و وێناکردنی ئەو دوو دەستەیەدا هەیە بۆ یەکتر و جۆری بەڵگەکارییەکانیشیان بە فۆرمێکی زمانیی ئاخاوتن و هونەری ڕەوانبێژیدا دەڕوات، نەک بەڵگەی زانستی و لۆژیکی. ئەو زمانەی لە هەردوو بەرەوە قسە لەسەر ئەویتر دەکات، زمانێکی نازانستی و تا سەر ئێسقان ئایدیۆلۆژیی و شیرو تیر لێکترسوونە..

هەموو ئەمە پێمدەڵێت نابێت لەو وێنەیەوە کە ئیسلامیستەکان بۆ (عەلمانیەت)ی دادەتاشن و لێوەی مامەڵە لەگەڵ سێکۆلاریزمدا دەکەن و نە لەو وێناکردنەشەوە کە عەلمانیەکان، بەناوی سێکۆلاریزمەوە بۆ ئایینی دادەتاشن و لێوەی مامەڵە



لەگەڵ دیندا دەکەن، تەماشای سێکۆلاریزم و دین بکەین. هەردوو ئەم چەمکە لەم نێوانەدا بوونەتە قوربانیی گەمەیەکی ئایدیۆلۆژیی کە ناتوانێت خوێندنەوەیەکی واقیعبینانە بۆ دین و سێکۆلاریزم بکات و بیانبەستێت بە بوونی مرۆییەوە. لە هەردوو وێناکردنەکەدا مەودایەک لە دین و لە سێکۆلاریزمیش هەیە. لە هەردوو وێناکردنەکەدا، تێگەیشتنێکی سادەو ڕواڵەتیانە لەو دیاردەیە هەیە، هەردوو وێناکردنەکە پێماندەڵێن کە لایەنگرانیان لە بڕیاری پێشینەوە مامەڵە لەگەڵ هەردوو چەمکەکەدا دەکەن و دەیانخەنە بریی ئەوەی خۆیان بە دینی دەزانن و لە بنەمادا ئایینە و ئەوەش کە بە سێکۆلاریزمی دەزانن و لە بنەمادا ئیدیعایەیەکی بەدوورە لە سێکۆلاریزم. خاوەنی هەڵگرانی ئەم دوو بەدگومانیە نەیانتوانیوە کۆمەڵگا بە ئاراستەی تێگەیشتنێکی لۆژیکی و قووڵ ببەن لە هەرکامێکیان و نەشیانتوانیوە لە دەرەوەی ئایدیۆلۆژیا مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن و نەشیانتوانیوە بنەماکانی سێکۆلاریزم و دین نوێ بکەنەوە. خستنەبرییەکی کوشندە لە هەردوو بەرەدا هەیە: بچووککردنەوەی دین لە ئایینەکان و گوێنەدان بەوەی ئایینەکان بەرهەمی میزاجی مرۆیین و دیسانەوە بچووکردنەوەی سیکۆلاریزم لە (عەلمانیەت)دا، دوو دیوی هەمان دراون. قسەکردن لەسەر دین لە کۆمەڵگایەکدا کە خنکاوە بە فۆڕمەکانی نومایشی ئایینداڕانە بە هەمان ئەندازەی قسەکردن لەسەر سێکۆلاریزم لە جیهانێکی کۆمەڵایەتیدا کە سیخناخە بە بێڕێزیکردن بە ئەقڵ و مافەکانی مرۆڤ و تاکایەتی و زانست، بێمانا و گاڵتەجاڕییە. لەوەش گاڵتەجاڕانەتر نەهێشتنی ئەو پەیوەندیەی نێوانیانە کە چۆن لە پەراوێزیدا ئازادیی لە دنیایەکی سێکۆلاردا ڕێگە بە ئازادیی بڕواداریی تاکەکەس دەدات و ئازادیی بڕوادارانەی تاکەکەسیش وەک گوناهێک و گەوجییەک لێکنادرێتەوە و دەبێتە بەڵگە لەسەر سەروەریی ئەقڵ و پێکەوەژیان و گفتوگۆ.. بۆیە نە ئەو تێگەیشتنە ئاییندارانەیە و نە ئەو تێگەیشتنە عەلمانیگەرایە، دەردی ئێمە بۆ دەستنیشانکردنی پێگەی دین و سێکۆلاریزم دەرمان ناکەن. ئیدیعای عەلمانیەکان بۆ جیاکردنەوەی دین لە حوکم لەسەر تێگەیشتنی ئەوانەوە بەندە لە ئایین، نەک لە دین وەک دیاردەیەکی ڕۆحیی و مەعنەوی، هەروەکچۆن تێگەیشتن و پیشووخواردنەوەی ئایینگەراکانیش لە عەلمانیەت وەکئەوەی سیکۆلاریزم بێت، لە بە هەڵە تێگەیشتنێکی کوشندەوە هاتووە و ئەوە





دەردەخات کە ئەم دووبەرەیە هیچیان بە وردیی و جیدییەتەوە لەو شتە شارەزا نین کە دژایەتی دەکەن. نە سێکۆلاریزم دین لە کۆمەڵگا فڕێدەداتە دەرەوەو دەیکاتە پێشمەرجی کۆمەڵگایەکی مەدەنی و ئاسوودە، نە دینیش لە خۆیدا دیاردەیەکی دەرەوەی جیهانێکی سێکۆلاریستیە. ئەگەر سێکۆلاریزم ڕووە شارستانی و ژیارییەکەی ژیانە، ئەوە دین و باوەڕداریی سوبژەکتیڤ دیوە خودیی و تاکگەراییەکەی ژیانە و ئازادیی ناو دنیایەکی سێکۆلار دژی ئازادیی تاکەکەسەکان نیە لە هەڵبژاردنی بڕوادا. ئازادیی لە سێکۆلاریزم و پێگەی ئەقڵ لە ژیاندا دژی ویست و ئازادیی تاکەکەس نین.



**گۆڤاری ڕوون : تاچەند ڕاستە گەر ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی گەورەی وەک (داعش) بەپێوەری ئیسلامی و عەلمانی لێک بدەینەوە؟ لەکاتێکدا لەپشتی داعشەوە چەندین ڕێکەوتننامەی سیاسی و ئابوری ونهێنی هەیە، وە یاریکردنی وولاتانی زلهێزە بەکۆمەڵێک مرۆڤی نەخۆش و یاخی لە کۆمەڵگە .**

ڕێبوار سیوەیلی: تەنانەت ئەگەر داعش خوازەیەکیش بێت بۆ شاردنەوەی ئەو پلانانەی لە پشتییەوەن، هیچ لەوە ناگۆڕێت کە داعش ڕووداوێکی گەورە و کارەساتبارە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. هیچ لەوەش ناگۆڕێت کە داعش ڕەوایەتی ڕەفتارەکانی خۆی لە ئایینی ئیسلامەوە وەردەگریت. بۆیە دەبێت لە بەرامبەر داعشدا هەم کۆمەڵگای جیهانی و هیومانیستی هەڵویستی لە ئاستدا وەربگرن و هەم دیندرانی ئیسلامیش وەک دینێک. ئەم مرۆڤە نەخۆشانە دوو شتیان نەوتوە: نەیاگوتووە ئێمەی داعشی مرۆڤ نین و نەیشیانگوتوە ئێمە مسوڵمان نین. بۆیە کۆمەڵگای مرۆیی ناتوانێت ئینکاری مرۆییبوونی ڕووداوی داعشییەت بکات و



کۆمەڵگای ئیسلامییش ناتوانێت بە نەخۆش لە قەڵەمدانیان و ئەوەی چەندین بابەتی نهێنی لە پشت داعشەوە هەیە، خۆی لە و پیسبوونە داعشیانەیە ڕزگار بکات.. لەگەڵتدا هاوڕام کە بڕیاری یەکلایەنە لەبارەی داعشەوە، دەمانخاتە هەڵەی ئەخلاقیی گەورەوە، بەڵام ئەوەش ئەخلاق نیە کە ئیسلامی لە دژی عەلمانی و عەلمانی لە دژی ئیسلامیی، داعش بەکار بهێنن.. لێکدانەوەی ساتەوەختی داعش بە پێوەری ئیسلامی و عەلمانی، بە هەمان ئەندازە ترسناکە، کە هەردوو لا بیانەوێت لە دەرەوەی داعش مێژوویەکی پاکژ بۆخۆیان دروستبکەن.. داعش بەوە لە مێژوو و بوونی ئیسلامی و عەلمانیەکان ناخرێتە دەرەوە، کە وەک پلانێک و دەستی دەرەکی و ڕێککەوتننامەی سیاسی و ئابووریی شیکردنەوەی بۆ بکەین. ئێمە ئەگەر بەشێکیش بین لە هێڵە گشتییەکانی ئەو پلان و ڕێککەوتنانە، ئەوە بە هۆی کوردبوونمانەوە بووین بە ئامانجێکی تایبەتی داعش، کە ئەمەش لەو کولتوور و مێژووەوە سەرچاوە دەگرێت کە داعشی پەروەردە کردووە و تیایدا کورد، یەهوودی و بەربەر و ئەرمەن و میللەتانی دی وێنای دوژمنییان خراوەتە پاڵ. لەو وێناخستنەپاڵەدا و لەو کولتوورەدا کە لەپشتیەوەیەتی، لە خاوەنەکانی پڕۆژەی پیکەوە بەستنەوەی بیرۆکەی عەرەبی_ ئیسلامییەوە ئامادەن تا دەگاتە سەر بەعسییەکان و تا دەگاتە داعش. ئەوەی داعش دەیکات و کردویەتی جێبەجێکردنی هەمان ئەو گوتارەیە کە لە ئەدەبیاتی عەرەبی_ئیسلامیدا ئامادەیی هەیە و بۆتە بناخە بۆ بەعسییەکان تا بەهۆیەوە تاوانی وەک ئەنفال ئەنجام بدەن و تا دەگاتە کۆڵۆنیالیستەکان، کە بەپێی پەیمانی سایکس بیکۆ، کوردیان کردە قوربانی گەمەیەکی سیاسی و تا دەگاتە هێرش و جینۆسایدی داعش بۆ ئێزیدییەکان هەمان گوتار درێژ دەبێتەوە.

بۆیە نە ئیسلامییەکان و نە عەلمانییەکان ناتوانن تەنیا بە تاوانبارکردنی یەکتر و دۆزینەوەی سەرچاوە دەرەکییەکانی داعش، خۆیان لەو بەرپرسیارێتیە بدزنەوە، کە پێشینەی فیکریی و عەقیدەتی و سیاسی هەر لایەکیان بەشدارە لە دروستبوونی داعش و هێرشکردنیدا بۆ سەر کورد، وەک ئەو بوونەوەرەی لە مێژوودا جێی نابێتەوە.. ئەگەر لە ئێستاشدا ئیسلامی و عەلمانیەکان بتوانن خۆیان لەو بەرپرسیارێتیە بدزنەوە، ئەوە حەقیقەتی ڕووداوەکە و تاوانەکە شایەتە لەسەر ڕەگوڕیشە عەلمانی و ئیمانیەکانی داعش و داعشیزم.



**گۆڤاری ڕوون : هەندێک لە توێژەران باوەڕیان وایە کە(داعش) و هاوشێوەکانی بەرهەمی مۆدێرنەیە، چونکە مۆدێرنە پاڵپشتی لەنوخبەیەکی سەرمایەدار و پرۆلیتاردەکات، ئەم ڕێکخراوانەش وەک کاردانەوەیەکی نابەرامبەر لەدژی ئەم حاڵەتە سەرهەڵدەدات وە بەناوی (دین و بەشێوەی مافیایی) بەرجەستەی دەکات. ڕای بەڕێزت لەم بارەیەوە؟**

ڕێبوار سیوەیلی: داعش ڕیکخراوێکی پێکهاتەییە. پێکهاتەیەکی عەقیدەتی/فیکری هەیە کە لەناو ئایینەوە شەرعییەتی خۆی وەردەگرێت. پێکهاتەیەکی تەکنەلۆژیی هەیە کە بەشیوەیەکی پرۆفێشناڵ و بە هۆی کەسانی پسپۆڕەوە ئیدارە دەکرێت و ئەمەش لە بەرهەمی میدیای ئەوان و کۆنترۆڵیان بەسەر تەکنەلۆژیای زانیاریدا دەردەکەوێت. پێکهاتەیەکی سەربازیشیی هەیە بە هەموو ئیمکانیەتێکی چەکدارانە و چەکی نائاساییەی لە مەیدانی جەنگەکانیدا ئامادەیە و پێکهاتەیەکی جەماوەریشی هەیە کە خۆی لە هێزێکی بەربڵاوی گلۆباڵ و جیهانگرەوەی فرە نەتەوەییدا دەبینێتەوە و جوگرافیای ئەم فەرەنەتەوەییەی داعش هەردوو جیهانی دەوڵەمەند و دیموکراسیی و جیهانی سێیەم و وڵاتانی هەژاری پاش کۆلۆنیاڵیزم دەگرێتەوە.

بۆیە ئەگەر لێرەوە بڕوانینە داعش دەبینین هێزێکی یەکخەری بان نەتەوەیی و جیهانگرەوەیە و ڕەهەندەکانی پێش مۆدێرن، مۆدێرن و پۆست مۆدێرنیش لە خۆی دەگرێت.

ئەوانەی لە وڵاتانی ئەورووپاوە دێن پێکهێنەری سیما مۆدێرنەکەی داعشن. ئەمانە کەسانی نەخوێندەوار و نەزان و هووشیار بە دەستکەوتەکانی مۆدێرنیتە نین. زۆربەشیان لەو وڵاتانە و لە هەمان سیستەمە مۆدێرنەکانی پەروەردەوە دەرچوون و ئاگان بە خودێتی و تاکایەتی و چوونەناو داعش بە لایانەوە وەک هەڵبژاردنێکی ئازادی تاکەکەسی لیکدەدرێتەوە..

نوسخە پێش مۆدێرنەکەی داعش ئەو کەسانەنە کە لە ژینگەی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوین، و ئەفەریقیا و ئەو شوێنانەوە هاتوون و هەڵگری کولتوورێکی زارەکین کە تیایدا تۆڵەکردنەوە و ڕاییکردنی مەیلی سێکسی و توندوتیژیی بۆماوەیی لە بنەما سەرەکییەکانی کەسێتی مرۆڤن و کۆگەرایی و شوان ویستی سیمای ناسینەوەیانە.



نوسخە پۆست مۆدێرنەکەی داعش، ئەو کەسانە پێکیدەهێنن کە هەڵگریی ڕۆشنبیرییەکی پرۆفێشناڵن لە بواری میدیا و تۆڕی کۆمەڵایەتی و جیهانی سایبەر سپەیس و دنیای ئەلیکترۆنی و بانکداری و ئابووری و گەشتیاری و بازاڕیی سێکس و پەیوەندیکردن و کۆی خەسڵەتە سەرمایەدارییە مۆدێرنەیان تێدایە بە زمانی ئینگلیزیشەوە وەک زمانی فەرمی پۆستمۆدێرنی سەرمایەداریی هاوچەرخ..

مۆدێرنە چەندە پاڵپشتی دەستەبژێرێک دەکات، ئەوەندەش دەستەیەکی زۆر لە ژیان دەتۆرێنێت و دەیانخاتە پەراوێزەوە. ئەگەر لەم گۆشە نیگایەوە بڕوانین و بزانین کە ئەو کەسانەی لە جیهانی مۆدێرنەوە و بە ئاگایی مۆدێرنەوە چوونەتە ناو داعشەوە، هەر لەو چین و توێژ و گرووپانەن کە کولتووری مۆدێرنی سەرمایەداریەتی جیهانگرەوە فڕیی داونەتە دەرەوە، ئەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت کە مۆدێرنەی سەرمایەداری بەشێکە لەو هاندەر و پاڵنەرانەی کە خۆراک دەبەخشێتە داعش. ئەمەش بەتایبەتی لەو مارگێناڵیزەکردن و بەپەراوێزخستن و فڕێدانە دەرەوەی گەنجانی نەوەی دووەم و سێیەمی پەنابەران و خەڵکانی نا ئەوروپایین، کە مسوڵمانانی جیهانی سێیەم و قوربانیانی دەوڵەتە ستەمکارەکانی ئەم ناوچەیە، بەشێکی زۆریان پێکدەهێنن.. ئەمانە وەک پرۆلیتاریای سەردەمی ئێمەن و لە ئەنجامی ئەو فڕێدانەدەرەوەیە و بەهۆی فریوخواردنیان بە پەیام و مژدەکانی داعش، تۆرانەکەی خۆیان لە دنیای مۆدێرن بە چوونە ناو توندئاژووییەوە باربوو دەکەنەوە دەبنە بەشێک لە مافیای ئایینی..

**گۆڤاری ڕوون : ئایا دەتوانرێت گەشە بە ئەزموونی کاری ئیسلامی لەکوردستان بدرێت وە ببێتە نمونەیەکی هاوچەرخ کە سەرچاوەی خۆشگوزەرانیی و ئاشتی کۆمەڵایەتی بێت، لەناوچەکەدا؟ یاخود چارەنوس و سەرەنجامی ئەزموونی کاری ئیسلامی لەکوردستان بە ڕای بەڕێزت بەرەو کوێ دەڕوات؟**

ڕێبوار سیوەیلی: پاشکۆیەتی عەقیدەیی حزبە ئیسلامیەکانی کوردستان و بەجێهێشتنی سەنگەری کوردستانییەت و چوونە ناو سەنگەری بەرگریکردن لە ئایدیۆلۆژیای پانعەرەبیزم و پانتورکیزمی ئیسلامیەوە، ئەو هەڵەی لە دەستدان



کە بتوانن گەشە بە ئەزموونی کاریی خۆیان لە کۆمەڵگای کوردیدا بدەن. ئەمە بۆ نەوەدەکان و پاشتر ڕاست بوو، بەڵام بۆ ئێستا و داهاتوو نا. لەبەر ئەوە ئەم حزبە ئیسلامیانە ئەو هەلەیان لە دەستدا و مەودایەکیان خستە نێوان خۆیان و هاووڵاتیانی کوردستانییەوە و تەنیا ئەوەندەیان لە خەڵک بۆ ماوەتەوە کە لەبەر تێوەگلانیان لە ڕووی حزبی و لەبەر لە ڕووداوان و زۆربەشی لە قین و ڕقی حزبەکانی دی ئەو خەڵکەیان لەگەڵە. حزبە ئیسلامییەکان چەند خوێندنەوەیەکی نا واقیعیان بۆ پێگەی خۆیان هەبووە کە ماوەیەکی زۆری دەوێت بۆ ڕاستکردنەوەیان.

یەکەم: نەدەبوو دژی دینداریی نەریتی لە کۆمەڵگای کوردستاندا بوەستنەوە. ئەو نەریتە ڕەگێکی قووڵی هەیە و بەشێوەیەکی کوردێندراوە، کە وەستانەوە لەدژی و بێ بەهاکردنی لەبەرژەوەندیی کەس ناکەوێتەوە.

دووەم: بە سیاسیکردنی دینداری و بە ئایینکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان و لێدان لە سیمبوولە دینیەکان و گرنگیدان بە کەرنەڤاڵ و مەراسیمی ئایینی و تەشریفاتی. لە ئەنجامی ئەمەشەوە، لەبیرکردنی کەسایەتیە مەعنەویەکانی نزیک خۆیان و بەرزکردنەوەی کەسانێک، کە لە ڕووی دانایی دینییەوە ئاستیان بەرز نیە و هەڵگری ڕۆشنبیرییەکی سنووردارن.

سێیەم: دژایەتی ناڕاستەوخۆیان بۆ دینەکانی دیکەی هەرێمی کوردستان و ڕێزنەگرتنیان لە بیروڕای جیاوازیی ئایینی و هاندان و پشتگیریی چەند وتاربێژێکی ئایینی و بڵاوکردنەوەی تەشهیر لە کەناڵەکانیانەوە بە دین و ئایینەکانیتر و بێدەنگبوون لێیان..

چوارەم: جەختکردنەوەی زۆریان بۆ پیشاندانی نومایشیانەی دین نەک بەرجەستەکردنی مەعنەویانە و فیکریانەی و ئەمەش لە هەوڵدانێکی زۆریاندا بۆ ئەوەی هەندێ بیروبۆچوونی کولتووری نێرسالاری بە ناوی دینەوە بەسەر ژندا بسەپێنن. ئەم ژنپۆشیینەوەیە بە مەرجەکانی نێرسالاری و ئایینسالاری، وەک ترسێکی ئەوان لە ئازادیی تاکەکەسی و کۆمەڵگای مەدەنی و بەعەرەبیکردنی کۆمەڵگای کوردستانی لێک دەدرێتەوە. بۆیە چەندە ئەوان لە مەدا سنووریی خۆیان بە هۆی ڕەهەندە نمایشیەکانی ئایینەوە دەستنیشان کردبێت و ئازادیی ئەویتریان بەناوی دینەوە، سنووردار کردبێت، ئەوەندەش لە کۆمەڵگای کوردی





دوور کەوتوونەتەوە و پەرچەکرداریی خەڵکیان لە ئاست خۆیاندا زیندوو کردۆتەوە.

پێنجەم: فراوانکردنی پانتاییەکانی دوورِوویی، بەجێهێنانی فەریزەکانی ئایین بەبێ پەروەدەکردنی رۆحیی مرۆڤ و رەچاونەکردنی بەرژەوەندیی گشتی. ئەم حزبانە وایانکرد هەرکەس کەمترین ئەرکە ئایینیەکان جێبەجێ بکات، لەبابەت حەج و عەمرە و خێر و زەکات و هتد، چاوی لێبپۆشرێ لە بواری دیکەدا، وەک بواری کەسابەت و بازاڕ و گوشار خستنە سەر خەڵک.. ئەمڕۆ بە ناوی دینەوە دەتوانیت ئەوپەڕی بەرژەوەندگەرایانە بژی و باریی ئابووری خۆت ببەیتە پێش و ئەمەش وەک بەشێک لە باوەڕداریی بخەیتە ڕوو، بەبێ ئەوەی کەس لەسەر ئەمە مەچەکت بگرێت. بۆیە دوورِوویی و فۆرمەکانی دەستبڕی و فرەژنی و هتد، وەک ئەو کردە کۆمەڵایەتیانە حسابیان بۆ دەکرێت، کە لە ژێر سێبەری ئەم حزبانەدا دێنە ئەنجام.

بۆیە ئەو هەلە لە ڕووی فیکری، ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت ڕێکخراوەییشەوە لە دەست ئەوان دەرچووە کە بتوانن ببنە نمونەی دروستکەری خۆشگوزەرانی. ئەم حزبانە تازە لە دوای داعشیشەوە ناتوانن لە هووشیارکردنەوە و تەرویجی ئادیۆلۆژیانەی ئایینیشدا شتێکی ئەوتۆ بە ئاپۆرەی خەڵک بڵێن، چونکە ئەمڕۆ خەڵک زۆر لە جاران بەرامبەر ئایینی ئیسلام هووشیار ترە. لەبەر ئەوە وەرەقەی ئیسلامیبوون لە دەستیاندا سووتاوە و ئەو وێنە داعشیانە بەوە ڕاستناکرێتەوە کە ئەوان جەخت لەسەر ئیسلامێتی بکەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم حزبانە زادەی ئەم کۆمەڵگایەن و بە جەختکردنەوەیان لەسەر ژیان و بەرژەوەندیی هاوبەشی نەتەوەیی و مرۆیی، دەتوانن ڕۆڵی گرنگ بگێڕن..





# قـــــۆنــاغـــــــــــــی

# پۆست سیكۆلاریزم

# و

# پۆست ئیسلامیزم

محمدباران

له ڕابردوودا زۆرێك له فیكرو تێزو ئایدۆلۆژیاو بیره جیاوازەكان وەها پێشكەشكراون و خراو نەته بەردەم مرۆڤایەتی كه ئەم فیكرو ئایدیا و تێزه جیاوازانه كۆتایی مێژوون و دوایین هەڵهێنجان و تێفكرین و بەرهەمی عەقڵی مرۆڤن،لەكاتێكدا بەردەوام عەقڵی مرۆڤایەتی له بەردەوامی و گەشەسەندن و گۆڕانكاری و بیری نوێ و ئایدیای نوێ و تێزه جیاوازەكان بەردەوام تەنگیان بەیەك هەڵچنیوه و جێیان بەیەكتر لێژكردووەو بانگەشەی دوایین بوونی بیردۆزەكان و بەرهەمەكانی فیكرو عەقڵ بەردەوام بووەته دەستپێكێكی نوێ بۆ كۆڵینەوەو وردبونەوەی زیاترو بەرهەمهێنانی دونیابینی نوێ.زۆرجار بانگەشه دەكرا كه ماركسیزم دوایین بەرهەمی ژیانی مرۆڤەكانەو دیموكراسی دواهەمینه و مۆدێرنێته كۆتاییەو سیكۆلاریزم دووایین پێشنیاری ژیانكردنی كۆمەڵگاكانەو ئیسلامییەكان و بزووتنەوه ئیسلامییەكانیش وایان دەزانی ئیسلامگەرایی و ئەو تاییه پێشكەشكراوەی جیهانی ئیسلامی سەرەتاترین و دواهەمینترین مۆدێلی بەرهەمهێنراوه له ئیسلام ،بەڵام به گەشەكردنی فیكری مرۆڤ و گەشەی سیاسی و فەلسەفی و ڕۆشنبیری و كلتوری و كۆمەڵایەتی كۆمەڵگا جیاوازەكان و لەبەرامبەریشدا به هۆی گەشەی فیكری ئیسلامییەوه ئەم بەرهەم و تاییه پێشكەشكراوانه جارێكیتر بوونه ڕابردوو و بیری نوێ و بەرهەمی نوێ و ڕەخنەی نوێ و نەخۆشی نوێیان تێدا



بینرا، دواجار کەوتنە ژێر گۆڕانکاری و جارێکیتر ئیشکالییەتەکانیان لە شێوەو تایپی نوێدا پێشکەشکرایەوە.هەردوو بەرەی سیکۆلاریزم و ئیسلامیزم وایان دەزانی ئامرازێکن بۆ دژایەتی یەکترو سیکۆلاریستەکان بۆچونیان وابوو دوژمنی هەموو ڕۆڵێکی ئاینن چ لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەوە،وا سیکۆلاریزم پێشکەشکرا کە پرۆژەیەکە بۆ وەدەرنان و پەراوێزخستنێکی ڕادیکاڵانەی ئاین لە بازنەی گشتیدا و بەرتەسککردنەوەی لە ژیانی تایبەت و تایبەتمەندی تاکەکەسیدا،تەنانەت **تیۆرە تەقلیدییەکانی سیکۆلاریزم باسیان لە دابڕانی ئاین و سیاسەت دەکرد و دەگەشتنە ئەوەی کە ئاین بەهیچ جۆرێك لەگەڵ سەردەمی نوێ و مۆدێرنە ناگونجێت**،تەنانەت بەرەی ئیسلامیزمیش هەمان تێڕوانینی بەرتەسکی هەبووە و دونیابینی وابوو کە ئیسلام بەهەموو شێوەیەك دژی عەقڵ و بەرهەمی عەقڵ و سیکۆلاریزمە و خۆشیان پێشنیارو دیدگای نوێیان نەبوو بۆ بەشداری ئاین و ڕۆڵی لە سیاسەت و حکومڕانی و وابیریان دەکردەوە کە وەزیفەی ئاین چەند وەزیفەیەکی دیاریکراو و بەرتەسکە،لەکاتێکدا ئاین لە ڕابردووی گەلاندا بێ وەزیفە نەبووەو بەردەوام ڕۆڵ و کاریگەری و وەزیفەی جودا جودای گرنگی هەبووە،چۆن سیکۆلارە توندڕەوەکان واهەستییان کردووە کە تەواوی حەقیقەت و ڕاستی ڕەها لای ئەوانە هەرواش ئیسلامییەکان وایان هەستکردووە تەواوی حەقیقەت و ڕاستییەکان لای ئەمانە،چۆن سیکۆلاریستەکان وابیریان دەکردەوە کە دەبێت ڕێگەی سیاسەت لە ئیسلامییەکان بگیرێت ئیسلامییەکانیش وابیریان دەکردەوە سیکۆلاریزم لە هیچ جێگەیەکی کۆمەڵگادا جێی نابێتەوە،هەروەها سیکۆلاریستەکان وایان دەزانی نوێبوونەوەی ژیان و کۆمەڵگاکان ڕێگرن لە بەردەم ئاین و بوونی ئاین و گەشەکردنی ئاین هەرواش ئیسلامییەکان هەستییان دەکرد نوێبوونەوەی ژیان و ژیانی کۆمەڵگاکان بەرهەمی سیکۆلاریزمەو نایەتەوە لەگەڵ ئیسلام و جەوهەری ئیسلامدا،سیکۆلاریستەکانیش وایان بیردەکردەوە کە ئاین دابڕێنن لە سیاسەت و بیگەڕێننەوە بۆ ژیانی تاك و ئیسلامییەکانیش وایاندەزانی ئاین واتە تەواوی ژیان و دەوڵەتداری و دەوڵەتی ئاینییان پێشکەشدەکرد،یەکەمین **دەرکەوتەی سیکۆلاریزم لە ڕۆژئاوا جوڵەیەکی دژە زوهدی بوو، واتە**



**خۆ دورگرتن و خۆ تەرككردن لە دونیا لەكاتێكدا خودی ئیسلام هاوسەنگییە لە نێوان دووانەی دین و دونیا،یان دونیا و ئاخیرەت و جەوهەری ئیسلام دورە لە تەركی دونیا و پەراوێزخستنی ژیانی دونیا**،بەڵام ئەوە ئیسلامییەكان و بزووتنەوە ئیسلامییەكان بوو تەرحی نوێ و دونیابینی نوێیان پێ نەبوو بۆ ژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتی سەردەمی نوێ،ئەگینا خودی پەیامی ئیسلام خاوەنی ئیشكالییەت نییە لەم بوارەدا.

دونیابینی سیكۆلاریستەكان بۆ ئیسلام و ئیسلامییەكان گشتاندن بوو كە سەرجەمی مۆدێلە پێشكەشكراوەكانی ئیسلام و بزووتنەوە جیاوازەكانی هەموو یەك جۆرن و یەك فیكرو یەك دیدگان و كە ئاوینەی ئیسلامێكی توندڕەو و بەرتەسك و دژە دونیا و ژیانی مرۆڤایەتین،لەبەرامبەریشدا فیكری ئیسلامیزم وای دەڕوانییە سیكۆلاریزم كە یەك شێوەیەو دژایەتی سەرلەبەری ئاینەو هەوڵی سڕینەوەی ئاین دەدات لە تەواوی ژیانی سیاسی و كۆمەڵایەتی كۆمەڵگاكاندا،لەكاتێكدا سیكۆلاریزم چەند شێوەی هەیەو **سیكۆلاریزمی سیاسی داوای جیاكردنەوەی ئاین دەكات لە دەوڵەتدا نەك لە سیاسەتدا، باس لە بێلایەنبوونی ئاین دەكات بەرامبەر دەوڵەت و دانەڕشتنی دەستوور لەسەر بنەمای شەریعەت**،هەروەها سیكۆلاریزمی فەلسەفی هەیە كە بڕوای وایە كە خودا و ژیانی كۆتایی و میتافیزیك بوونی نییەو لەكاتێكدا **سیكۆلاریزمی لێبوردە هەیە كە بێلایەنی هەڵدەبژێرێت بەرامبەر ئاینەكان و ئازادی دەدات بە ئاین و سروتەجیاوازەكانی لە كۆمەڵگادا و دەوڵەت ئاینی ڕەسمی دەبێت و ڕێگەی سیاسەت لە هێزە دینییەكان ناگرێت**.بۆیە سیكلاریزمیش خاوەنی دیدگای هەڵەیەو تێڕوانینی ناڕاست و نەپێكراوی هەیەو گریمانەی هەڵەی زۆری تێدایە كە خودی وێنەی سیكۆلاریزم لەگەڵ دونیای نوێ و واقیعی نوێ نایەتەوە،بۆیە پۆست سیكۆلاریزم دەیەوێت هەڵبكات لەگەڵ ئاین و نایەوێت وەك ڕابردوو خۆی بە بەدیلی ئاین نمایش بكات و بایەخ دەدات بە دونیای ئاخیرەت و میتافیزیك و چەكی كات بەكاردەهێنێت كە خودی ئیسلام خاوەنییەتی واتە (دەهر ) و ڕۆژگار . ئەو خەونەی سیكۆلاریزم كۆتایی هات كە وای دەزانی كۆتایی مێژووە،چۆن ماركسیزم پێشتر خەونی بەوەوە بینی،ئێستا





گەڕانەوەی سیكۆلاریزم هەیە و خوێندنەوەی نوێتر بۆی هەیە ئەو هەستەی پێشتر وای دەزانی كە ئاین بەرەو لاوازی دەچێت و دەتوانێت پەراوێزی بخات لە كۆمەڵگادا گۆڕاوەو **پۆست سیكۆلاریزم سەرگەرمی داڕشتنەوەی ئایدیا و فیكرییەتی و ئێستا ئەو شەڕی ئاینێكی بەهێزی پێ ناكرێت و ناچار دەبێت ڕوئیاكانی بگونجێنێت لەگەڵ ئاینە بەهێزەكەی نێو كۆمەڵگاكان**، بەهێزبوونی ئاین لە كۆمەڵگاكاندا چ وەك ناسنامە و گەڕانەوە بۆی و زیادبوونی خوێندنەو لیكۆڵینەوەكان دەربارەیی و چ وەك لایەنی مەعنەوییەت و گەڕانەوە بۆ لایەنی مەعنەوییەتی ئاین لای زۆرێك لە كۆمەڵگاكان دەبینرێت،لەكاتێكدا **سیكۆلاریزمی توندڕەو بۆچونیان وایە كە نابێت خوێندن و توێژینەوە لەبارەی ئاین بكرێت و تەنانەت لە گۆشەنیگای كلتوری و مێژوویشەوە،ئاین چ وەك سروت و پەرستشەكان چ وەك بابەتی زانستی توێژینەوە ڕەتدەكەنەوە**.كاتێك ئاین ببێتە كاڵای باڵای دەوڵەت و ڕێگە لە ئازادی ئاینەكانی ترو مرۆڤەكان بگرێت جیاوازی چییە لەگەڵ سیكۆلاریزمێكدا كە خۆی ببێتە بەدیلی ئاین و ببێتە كاڵای باڵای دەوڵەت و خۆشی ببێتە ڕێگر لە ئازادی ئاین و هەوڵی پەراوێزخستنی بدات،هەروەك **سروش دەڵێت ڕەخنەی من لەوەنییە كە بۆچی سیكۆلارن،بەڵكو ئەوەیە كە بەتەواوی سیكۆلار نین،سروش پێی وایە لە ئیسلامدا تەنها( بواری سیاسەت ) پێویستی بە بەسیكۆلاركردنە**،ئەگینا تەواوی ئاین كێشەی نییە هەروەها پێی وایە تەنها **زوهد و زوهدگەرایی و بابەتی ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە سیكۆلارنین**،ڕێگری دەستێوەردانی كەسانی ئاینی لە حكومەتداری بەشێكە لە ئاین و مافی حاكمییەت لە ئیسلامدا بە هۆی دینەوە ناتوانرێت بدرێتە كەسەكان و پێی وایە زوهد بەشێك نییە لە ئیسلام و لەبەرامبەر حاكمانی ستەمكارو زاڵم زوهد گەشەی كردووە لە ئیسلام و ئەدەبیاتەكەیدا،بۆیە سروش پێشنیاری كۆمەڵگایەكی ناسیكۆلار دەكات و لەبەرامبەریشدا حكومەتێكی سیكۆلار دەخوازێت ،هەروەك چۆن **هابرماس پرسیارێكی جیددی دەوروژێنێت لەبەرامبەر سیكۆلاریستەكان كە ئایا ڕێ چارەتان چییە بۆ ئاشوب و گرێكوێرە و مەینەتییەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوین هەر لە سیاسەتی دیكتاتۆرانە و كۆمەڵگا و تاكی دەمارگیر،یان**



**سیکۆلاریزم ویستویەتی هەمان مەینەتی دوبارە بکاتەوە**،یان خۆی بکاتە بەدیلی ئاین،**سروش پێناسەی ئیسلامیزمی ئایدۆلۆژیك دەكات بەوەی كە دەخوازێت حوکمڕانی بکات لە پێناوی جێبەجێکردنی شەریعەت،بەڵام ئیسلامی پۆست ئایدۆلۆژیك فرەیی خوازە و دیموکراتیکەو کەمترین چاوەڕوانی هەیە بۆ ئاین لەم بوارەدا و حکومەت وەك خواستی گشتی تەماشادەکات**.کەخۆی لە خۆیدا ئەمە خاڵی جیاکەرەوەی قۆناغی ئیسلامیزم و پۆست ئیسلامیزمیشە،بۆیە ئەوەی لای سیکۆلاریزم پێی دەوترێت دونیاگەری خۆی پێکهێنەرێکی سەرەکییە لە بیرو باوەڕو تێڕوانینی ئیسلام بۆ ژیان ،هەروەك چۆن لە تێڕوانینە ڕۆژئاواییەکە بۆ مەسیحییەت ئەوەیە کە سیکۆلاریزم واتە بایەخدان بە دونیا و ژیانی ڕۆحی ،هەروا ئیسلام خۆی ئاینێکە سێکۆلاریستە کە ئاینێکی دونیاییەو بایەخ بە دونیای مرۆڤ و جوانکردنی و کردنی بە خەلیفەی ڕاستەقینە لەسەر زەوی دەدات.عەلی عیزەت بیگۆڤیچ جوانی ووتووە کە **ئیسلام هەروەك وەك یەکبوونی گیان و جەستە یەکبوونی ئاین و سیستەمی کۆمەڵایەتییە**،بۆیە گەر پۆست سیکۆلاریزم بریتیبێ لە ئازادی بیرو باوەڕو مافی مرۆڤ و بێ لایەن بوونی دەوڵەت بەرامبەر ئاینەکان ئەوا ئیسلام دەتوانێت هەڵوێستی ئیجابی هەبێت بەرامبەری.بۆیە قۆناغی پۆست ئیسلامیزم پێشنیاری دەوڵەتی ئاینی دەگۆڕێت بۆ دەوڵەتی مەدەنی کە دەستورێکی مەدەنی بە هاوبەشی و کۆدەنگی تێدا دەنوسرێت.هەروەك چۆن قەرزاوی لە کتێبی (الاسلام و العلمانیە) دوو فەرموودەی هێناوە کە ئیسلام گرنگی داوە بە کاروباری دونیا و گرنگی شارەزایی و پسپۆڕی لەکاری دونیادا،پێغەمبەر (دخ) دەفەرموێ (ئێوە لە کاروباری دونیا شارەزاترن) یان دەفەرموێت (ئەوەی پەیوەندی بە کاروباری ئاینەکەتانەوەیە بۆ منی جێبهێڵن و ئەوەی پەیوەندە بە کاروباری دونیاشتانەوە ئەوە بۆ خۆتان شارەزاترن)

کەواتە لەم قۆناغی پۆست ئیسلامیزم و پۆست سیکۆلاریزمەدا پێویستمان بە بێلایەنی حکومەت هەیە واتە حکومەت هەڵگری ئایدۆلۆژیا نەبێت و لە بەرامبەریشدا ئیسلام بوونی دەبێت لە سیاسەتدا و لە پێکهێنانی سیستمی سیاسیدا،بەڵام لە حوکمڕانیدا شارەزایی و



زانست و ئیدارەی دروست بنەمان،ئاین دەبێتە بەشێك لە سیستمی سیاسی و لە چوارچێوەی گشتیدا کەس خاوەنی حەقیقەتی ڕەها و سەپێندراو نییە و سیکۆلاریزم نابێتە ڕێگر لە کاری سیاسی هێزە ئیسلامییەکان و بزووتنەوە ئیسلامییەکانیش دەگوێزنەوە بۆ قۆناغی حیزبی هەموان و مەڕجەع ئیسلامی و خاوەن پڕۆژەو پەیامی گشتی کۆمەڵگا و ئاین و هێزە ئیسلامییەکان ناترسن لە دونیای نوێ و مۆدێرنەو سەپاندن و یەك ڕەنگکردنی کۆمەڵگا نابێتە خەونی هیچ لایەکیان.

سەرچاوەکان


* **عەلمانییەت و ئاین ،محمد ئارگۆن**

* **دین و دونیا ،مەریوان قانع**

* **داعش لە نێوان توندڕەوی ئاینی و شکستی دەوڵەتدا،ئەبوبەکر کاروانی**

* **دەوڵەتی مەدەنی لەدیدێکی ئیسلامییەوە،هادی عەلی**

* **ئاین لە سەردەمی مۆدێرنەدا،عبدلکەریم سروش،وەرگێڕانی،هێرش کەریم**

* **بە سیاسیکردنی ئیسلام،شێرکۆ کرمانج**

* **سیکولاریزم در تعاریف هابرماس.محسن زاکری**

* **اسلام دینی سیکولار است،عبدالکریم سروش،سایت ایلینا**

* **مقاله دین و مدرنیته،عبدالکریم سروش،1385**

* **کنفرانسی اسلام گرایی پوست اسلام گرایی،عبدالکریم سروش،دانشگاه کوینز،کندا**



# ئەمڕۆ و دوێنێی ئیسلام و ڕۆژ ئاوا



د.سید حسین نصر

و. بەختیار محەصالح

شەڕی ئیسلام و ڕۆژ ئاوا پاڵنەر و هۆکارگەلی ڕیشەیی زۆری هەیەکەبۆ شیکردنەوە و چارەسەرکردنی ئەم شەڕەش سەرەتادەبێت واقع بینانە ئیسلام و ڕۆژ ئاوابناسین، بەسەرنجدان وئاوڕدانەوە لەمێژووی ئەم جەنگە و لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی پێشهاتە تازەکان شیکردنەوەیان بۆبکرێت. پێویستە بەربەستەکانی بەردەم لێکتێتگەیشتنیان بناسرێت بەپێداگیریی و سوربوون لەسەر خاڵی هاوبەشیان بیرلەچارەسەرکردنیان بکرێتەوە. پێویستەکاتێك گفتوگۆلەسەر ئیسلام و ڕۆژئاوادەکرێت ڕوونی بکەینەوە کە ئایە مەبەستمان کام ئیسلام و کام ڕۆژئاوایە، ئایا مەبەستمان لەئیسلام ، ئەوئیسلامە سوننەتیەیە کەلەلایەن زۆربەی موسڵمانانەوە ئەزموون کراوە؟ ئیسلامێك کەبەڕۆشنی بەیانکراوەتێدا ملکەچی گوێڕایەڵی لەبەرامبەر ویستی پەروەردگاردا بنچینەو بونیادێکە کەجێگەی باسە، یاخود مەبەست لەئیسلام تەفسیرو لێکدانەوە نوێیەکانە، کەلەخواست ویستی لێکدانەوەی سونەتی ئیسلامیدا لەسەربناغەی تێڕۆانینی سەردەمیانەی



ڕۆژئاواو فکری نموونەییان دەبێت؟ یاخودمەبەست لەئیسلام ئەونموونە توندڕەوییە یەکە لەسەر چالاکییە توندەسیاسیەکان هاوڕێ لەگەڵ توڕەیی وهەڵچووون تیرۆردا دامەزراوە . لەبارەی ڕۆژئاواشەوە بابەتەکە بەهەمان شێوەیە. مرۆڤ توشی سەرسوڕمان دەبێت کەئایا ڕۆژئاواییەکان کەسانێکن کەدەڕۆن بۆدیدەنی دەوڵەمەندەکان و پیاوماقوڵەکان یان ئەو عارفانەی کە ئینکاری خوادەکەن؟

هەمووموسڵمانێك قورئانی پیرۆزی وەك فەرموودەی خوای گەورەو پێغەمبەریش وەك پەیام هێنەردەناسێت، بەلاّم لای ڕۆژ ئاواییەکان بناغەی بیرکردنەوە وئالۆگۆڕی بنچینەی ڕەسەنایەتی قازانجە ، بابەتگەلی وەکو باوەڕبوون بەخودا یان ئینکاری بوونی خودا کاروباری تاکەکەسین .

لەلایەکی ترەوە پێدەچێت موسڵمانان بۆگەیشتن بەفەرمانڕەوایەتی سیاسی و جاری بوونی یاسای ودەستوری ئیسلام بۆکۆمەڵگە بەجەنگەوە سەرقاڵن بن ، بەلاّم ئەمڕۆ لەڕۆژئاوادا کەمتر شەڕی سیاسی دەبینرێت ، لەبارەی بنەمای چییەتی کتێبی پیرۆز و ڕێنمای و ناوەڕۆکەکانیشیانەوە ناکۆکی ودووبەرەکییەکی زۆر لەنێوان توێژەراندا بوونی هەیە .

لەڕابردوودا هەتا لەسەدەکانی ناوەڕاستدا کەبۆ یەکەمین جار ڕۆژئاوا لەبەرامبەر ئیسلامدا وەستایەوە، هەردووکیان لەهەندێك بنەمای وەك چۆنێتی پەسەندکردنی خودایك لەودیوی هەموو پابەند بونەکانی وەك تاك سەنتەری مرۆڤ و ڕێزگرتن و قبوڵکردنی یەکتری و هاوبەش بوون، ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاست بەچاوی ڕێزەوە دەیان ڕوانییە ئیسلام پێشکەوتنەکانی ، لەڕاستیدا نەفرەتکردن لەئیسلام بەشێوەیەکی ئاشکرا هەم لەڕوانگەی فکری وهەم لەڕوانگەی مەزهەبییەوە ، لەگەڵ ڕینسانسدا دەستی پێکرد.کەتایبەت مەندییە بنچینەییەکانی ئەم سەردەمە بریتی بوون لە بەتاك وتەنها بینینی مرۆڤ ودژایەتی کردنی دڵنیایی بەدەست هاتوولەئیمان وڕەزامەندی لەسەر (بەسەنتەر بوونی ئەوروپا) کە بنچینەی بایەخەکەشی بۆ پەیوەندی ماددی بازرگانی کردن و پیشاندانی بی مەزهەبی بەتاك خشینی مەزهەب قایم و پایەدار بوو ، ئەم دژیەکییە لەگەل ئەندێشەی موسڵماناندا جێگیر بوو ، وەبەهۆی ئەوەی کەدیدگای ڕۆژ ئاواوە مرۆڤ وێنابکرێت کەبەتوندی دژی دیدگای ئیسلام بوو بۆمرۆڤ.







لەسەردەمی ڕێنساسدا، ڕۆژئاواپلەبەپلە لەڕوی ئابوری و تەكنەلۆجیا وسوپاییەوە پێشكەوت لەلایەكەوە لەبری خەلاتی كافركردن و نەفرەتكردن لەئیسلام ، چەندین توێژینەوەی نوێ لەسەر ئیسلام ئاڕاستەكران و بەسەرنجدان و ورد بونەوە لەتوانای خۆیان ، هەوڵیاندا كەجێگەی ئیسلام لەكۆمەڵگەی ڕۆژئاوادابكەنەوە.

وانەی نادینی لەقوتابخانەكان ناساندنی سەرمەشقێتی ڕۆژئاوا بەناونیشانی بایەخی لەپێشتر ، شیكردنەوەی قورئان وەكو نوسینێكی تازە كەناتوانێت وەكو فەرموودەی خودا تەماشابكرێت وبانگەشسە ی پاوانخوازیو قورخكاری ڕێگەی خۆش بەختی مرۆڤایەتی لەهەڵبژاردنی پێشەوایەتی ڕۆژ ئاوادا ، درەوشانەوەی ئەم هەولانەی ڕۆژئاواییەكان .

تازە بەتازە بابەت گەلێك لەپەیوەندی نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوا پەیدابووە لایەك شایەتی بوژانەوەی ئیسلام لەجیهانی ئیسلام دا او لەلایەكی تریشەوە چاودیری گوشاری زۆری ڕۆژئاواین لەسۆنگەی دەسەلاتی تەواوی كەلتوری خۆیان لەسەر بناخەی ڕێبەرایەتی ڕین سانس . بنچینەی ڕاستەقینە لەپەیوەندی نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوا ئەوەیە كەپێچەوانەی چاوەڕانییەكان و زۆریك لەگریمانەكانی ڕۆژئاوا كەپێشبینی هەڵوەشانەوی ئیسلامیان دەكرد .

بەلام ئیسلام هێشتا لەحالی بزاوتندایە شاراستانێتی ئیسلامی بزێوە ، ئەگەرچی ئیسلام بەشێوەیەكی تێبینی كراو لاواز بووە پێویستە بوترێت لەدوای سەدەكانی ناوەڕاستەوە ئیسلام بەسادەی لەگۆڕپانی ئەندێشەوكاردا لەلایەن مۆدێلی ڕۆژئاواییەكان گەمارودرا كەدەتوانیین بڵێن زۆرێك لەكردەوانەی موسڵمانانی نوێ خواز ئەنجامی دەدەن بەهیچ شێوەیەك دژیەكی لەگەڵ ڕۆژئاوادا نییە. پەسەندكردنی ئیسلام لەلایەن مەسیحیەتەوە بەراورد بەقبوڵكردنی بایەخی مەسحیەت لەلایەن ئیسلامە وە زۆردژوارترە .

ئەگەرچی ئیسلام قبولكردنی سێ پیرۆزەكە( خودا ، مەسیح ، وەجوبرەئیل) و وێنەی خەیالی (تجسم) قەدەغەدەكات، بەلام بنەڕەت و ڕیشەی خودایی ، پەیامی مەسیحەت قبەولدەكات وپێغەمبەری گەورە حەزرەتی مەسیح (سەلامی خوای لەسەر بێت) لەپێش حەزرەتی محمد (د.خ) دەزانێت .



ئیسلام ڕێگەی بەکەمینە مەزهەبییەکان داوە بەواجباتەکانی مەزهەبی خۆیان ڕابگەن .

وەدی هاتنی لێکتێگەیشتن لەنێوان ئیسلام ڕۆژئاوادا پێویستی بەوەیە کەئاگاییەکی تازە لەبارەی ئیسلامەوە بێتەدی و بەشێوەیەکی یەکجاری بانگەشەکان دژی ئیسلام بوەستێت و دووپاتی خاڵی هاوبەشی نێوان ئەم دووشارستانێتە بکاتەوە.

جێگەی سەرنجە کەڕۆژئاوا ئەو ڕۆژئاوایەنییە کەتەنها بەپێوەرە ئابورییەکان دەناسرێت ، بەڵکو مەبەست شارستانییەتی ڕۆژئاوایە کە زۆرێك لە بنەماکانی وەرگیراون لە پێوەری ئەخلاقی و مەزهەبی جێگای سەرنجە کە خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ ئیسلامدا هەیە ، یەکێك لە تەگەرە زۆر و زەبەندەکانی ئەم لێکتێگەیشتنە بوونی ئەم گریمانەیەیە کە دەبێت تەواوی شارستانییەتەکانی جیهان شوێنکەوتەی شارستانییەتی نا دینی ڕۆژئاوا بن ، کە لەمێژوو ی ڕۆژئاوای دوای ڕێنیسانس دەست پێدەکات.

یەکێکی تر لە جیاوازییەکانی ئیسلام و ڕۆژئاوا ناکۆکییەکە لە چۆنییەتی ڕوانگەی مەزهەبیان بە جۆرێك کە جیاوازییەکی دزێوی لە پەیڕەوکردنی دەستوورە دینیەکانی نێوان موسوڵمانەکانی ڕۆژئاواییەکان بەدی هێناوە.

لەمپەرێکی تر لەبەردەم لێکتێگەیشتنی ئیسلام و ڕۆژئاوادا چالاکی بانگخوازی مەزهەبی ڕۆژئاوایە کە زۆرێك لە ناوچەکانی دونیادا چالاکی بانگخوازی مەزهەبی ڕۆژئاوا هۆکاربووە بۆ قازانجی نا مەزهەبی ڕۆژئاوا لە سەردەمی داگیرکەردا . بەجۆرێك کە لە زۆرێك لە ناوچەکانی ئاسیا و ئەفریقادا ئەندێشە نامەزهەبییە تازەکانی ڕۆژئاوا وەك پەیامی مەسیحییەت بانگەشەی بۆ دەکرا.

لەمپەری زۆر و زەبەندە لە تێگەیشتنی ئیسلام و ڕۆژئاوادا هێشتا بوونی هەیە ، بەڵام دەبێت هەمەلایەنی مەسیحییەت و هەمەلایەنی موسڵمانانەوە هەوڵگەلێك بدرێت بە مەبەستی زاڵبوون بەسەر ئەم لەمپەرانەدا ، ئەویش بەلەبەرچاوگرتنی بابەتی پەیوەندی نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوا لە شێواز و فۆڕمێکی نوێدا. دەبێت هەردوو لا مافی ئەوەیان هەبێت کە لە دوو دیدگای تەواو دژییەك واتە ئیسلام و سیکیولاریزمی مۆدێرن چاوەڕوانی لێکنزیکی ناکرێت ، بەڵام بەدیهاتنی پەیوەندی لەسەر بناغەی ڕێزگرتنی بەرامبەر ڕازیبوون بە بایەخ و گرنگی مرۆڤ ، قبوڵکردنی ئازادی بیروباوەڕ ، دەستدرێژی نەکردنە



سەر یەکتری ،دانانان و دروستکردنی لەمپەر لەبەردەم نیازی خراپ بۆ چاوبڕینە خاك و سامانی یەکتری ، هەوڵنەدرێت بۆ لەناو بردنی کەلەپووری یەکتری، لە ژێر سێبەری هاریکاری هەردوولا.

# نوێبوونەوەی فکری ئیسلامی لە نێوان دوێنێ و ئەمڕۆدا



د.عمرعلی:

فکر چی یە؟ فکر بەمانای تێگەشتن دێت، واتە کۆمەڵە بیرۆکەیەکە لە مێشکی مرۆڤدا گەڵاڵە دەبێت و لەسەر شتێك یان کۆمەڵە شتانێك دەنیشێتەوەو دەبێتە بڕوایەکی تەواو لای مرۆڤ و هەوڵ بۆ ئامانجەکانی دەدات.

کاتێك دەوترێت بیرۆکە ئەویش دەتوانین لقەکانیشی دەستنیشان بکرێت وەك: دەرك کردن، هۆشیاری، بەهێزی هەست پێکردن، خەیاڵ.

جگە لەوەش جۆرێتی بیرکردنەوەکانیش لەسەر بیرلێکەرەوە زۆرن، تەنها هەندێکیان ئاماژە پێ دەکەین وەك: بیکردنەوەی ئاسای، بیکردنەوەی عاتفی، بیکردنەوەی لۆژیکی، بیکردنەوەی وەرزشی، بیکردنەوەی ڕەخنەی، بیرکردنەوەی داهێنان.

ئیشی فکر هەروەها لەگەڵ زانیاریەکاندا کار دەکات و بەدوای ڕێگە چارەدا دەگەڕێت و هەولی پێشکەوتن و سەرکەوتنی دەدات.

ئەم خستنە گەڕی بیرو هۆشیاریەو بە ئاگابوونە کارێکی داواکراوە لە مرۆڤەکان و هۆکاری بەردەوامی و بەرەوپێشچوونی ژیانە، بە تایبەت بیرکردنەوەی داهێنان[i].

جێگەی خۆیەتی لێرەدا ئاماژەی پێ بکرێت گشت ئەو فکرانەی لەبواری داهێناندا کاریان کردووە تەواوی مۆرڤایەتی تێیدا بەشدارە لە کۆن و نوێدا، بەبڕوای ئێمە لە جێگەی خۆیدا نی یە گەر بەرگی ئایدۆلۆژی بەبەرگدا بکرێت، گەرچی ئایدۆلۆژی دەتوانێت کاریگەری لەسەر فکری داهێنان هەبێت، زیاتر پەیوەستە بەو زەمینەی کە



بۆی دەسازێت، بێگومان تا زەمینە لەباربێت و لە دۆخی ئاسایدا بێت زیاتر ئەمیش کار دەکات، بۆ نموونە گشت ئەو زانستانەی کە ئێستە بەرهەم هاتووە گەر فکری ئایدۆلۆژی و دین و چەپ و ڕاستی بەبەردا بکرێت ئەوا زانا ئیسلامیەکان ئەگەر بناغەدانەری

| الاسم | مجــال الدراســة |
| --- | --- |
| جابر بن حيان | الكيمياء |
| الأسمائي | علم النبات, علم الحيوان, الزراعة الحيوانية |
| الخوارزمي | الجبر, الرياضيات, علم الفلك, جغرافيا |
| الجاهز | عالم الحيوان, تأليف المعاجم, قواعد اللغة العربية |
| الكندي | الفلسفة, الفيزياء, علم البصريات, الطب, الرياضيات, علم المعادن |
| عباس بن فرناس | تقنية الطيران, جهاز حركة الشمس |
| ابن سينا | الطب, الفلسفة, الرياضيات, علم الفلك |
| ابن النفيس | الطب, الفلسفة, الفقه, الحديث |
| ابوالصلت | الهندسة, الأدب, الموسيقى |
| الرازي | الطب, طب العيون, علم الفلك, الكيمياء |
| عبد القادر الكيلاني | فكر إسلامي تصوف إسلامي, |
| الطبري | فن الخط, الطب, الأدب, والرياضيات |
| ابن الهيثم | الهندسه,البصريات, والرياضيات |
| ابن رشد. | علم الفلك, الطب, الفلسفة, والالحساب |

نەبووبن ئەوا پشکی شێریان تێیدا بەرکەوتووە، لێرەدا چەند زانایەك بە پلەبەندی ئەو بوارەی کە داهێنانیان تێدا کردووە دەخەینە ڕوو بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە فکر ئەنجامی ژیری مرۆڤەکانەو خۆی بۆخۆی سەرچاوەی بنەبڕی کارەکان نی یە، جگە لەوەی کە ئەو سەرچاوانەی کەوا بۆ فکرەکان پشتی پێ دەبەسترێت ئەوانیش کاریگەری بنەڕەتیان لەسەر فکرەکان هەیە، وە کاتێك بۆ



سەرچاوەكانیش دەگەڕێینەوە ئەوانیش هەر سەرەنجامی فكری مرۆڤەكان بووە تەنها پەرتوكێك نەبێت كە ئەویش قورئانە[ii].

كەواتە لێرەدا قورئان وەك تاكە كتێب و سەرچاوەیەك لە مەیداندا هەیە كە تەحەدای گشت مرۆڤایەتی پێكراوەو هاوشێوەی نی یەو نابێت، ئەم پەرتوكە پیرۆزە دەكرێت سەرچاوەی بنەڕەتی فكرەكان بێت و لە كاتی ناكۆكیەكانیشدا گەڕانەوەو پشت بەستن بەو بێت،گەر وەك كەسێكی ئەكادیمی پیشەیی و دوور لە ئینتیمای دینی و دژە دینی، بەناو مێژووی ئیسلامیدا گوزەر بكەین و كارەكان بخەینە تەرازووی فكرەوەو بە ئێستەو داهاتوویەوە ببەستین، سەرەنجام دەگەین بەو بڕوایەی گشت نەهامەتی و ئەو خاڵانەی كە بەلاواز لەسەر ئیسلام ئەژمار دەكرێت تەنها فكرە نەك قورئان و خودی ئیسلام.

مێژووی ئیسلامی لە سەردەمی خودی پێغەمبەر محمد درودی خوای لەسەر بێت تا كۆتا خەلافەتی ئیسلامی كە عوسمانیەكان بوو وە گشت لاپەڕەكانی هەڵ دەینەوە كارانێك كە كرابێت و توێژەرەوان هەڵوێستەیان لەسەر كردبێت بۆ لاوازی فكرەكە گەڕاوەتەوە، نەك قورئان، یان بەمانایەكی تر عەقیدەو شەریعەت.

**ئەوەی جێگای تێڕامانە وەك لایەنە نەرێنیەكەی فكر لە مێژووی ئیسلامی و بزاوتە ئیسلامیەكاندا گەورەكردنی فكر بووەو تێكەڵی لەگەڵ قورئاندا یان دیسان بە مانایەكی تر عەقیدەو شەریعەتدا.**

زۆرجار نەتوانراوە فكر كە زادەی بیركردنەوەی مرۆڤەكانە لەسەردەمێك لە سەردەمەكاندا بە ڕوونی جیابكرێتەوە لە عەقیدە، لە فیقهی ئیسلامی، لە بنەماكانی یاسای حوكمڕانیدا لە ئیسلامدا.

سەرەنجامی هەڵەی بەجۆریكی فكرەكە بووە كراوە بە خاڵێك لەسەر ئیسلام و دەقە شەرعیەكان، هەربۆیە لە تەواوی مێژووی ئیسلامدا تا ئێستە ئەوەی زیاتر جەختی دەخرێتە سەر ئاكارو كرداری كەسایەتیە دینیەكانە نەك خودی دەقەكە، واتە لەبری ئەوەی كردارەكان بە دەقەكان بپێورێت بە پێچەوانەوە ڕەخنە لە دەقەكان گیراوە بەهۆی كردارەكانەوە، بۆ نموونە لە قورئاندا چەندین ئایەتی بەرگری و ڕووبەڕووبوونەوەی



تێدایە کە کاتەکە کاتی جەنگ و بەرگری کردنە، بەڵام هەندێك جار لە دۆخێکدا ئەو کارە کراوە مانای تەواوی بە خودی ئایەتەکە نەداوە! دواتر کردارەکە کراوە بە تەرازووی ئایەتەکە، کە ئەوەش سەرەنجامی فکری بەشەرەکان بووە کە کاتێکی ناوەختیان بۆی هەڵبژاردووە، بە پێچەوانەشەوە لە هەر سەردەمێکدا فکرەکە قوڵ بوو بێت و جوانتر لە دەقەکان گەشتبن خزمەتێکی گەورەو بەرچاوی بەشەریەتی کردووە بەشێوەیەك ڕەحمەت و ڕەنگدانەوەی لەناو کۆمەڵگەدا بەرز نرخێنراوەو ئێستەش مێژوو بە شانازیەوە دەیگێڕێتەوە...

لە هەر سەردەمێك لە سەردەمەکاندا کە پابەندی بە قورئان و دەقە ڕاستە شەرعیەکان دراوە زیاتر ڕەنگدانەوە لە فکرو بۆچوونە بەشەریەکانیشدا هەبووە، تا بۆ پاشتر بگەڕێینەوە زیاتر ئەمە هەست پێ دەکەین، تا بۆ پێشتر بڕوانین هەڵە زیاتر بەدی دەکەین.

بە پێی دەقی فەرموودە باشترین سەردەم سەردەمی پێغەمبەر بووە درودی خوای لەسەر بێت و دواتر چەند جیلێکی تر، هۆکاری ئەوەش بۆ پابەندی زیاترو گەڕانەوەیان بە دەقە شەرعی و ڕەسەنەکان بوون، دواتر کە فکر زیادەڕەوی تێدا کراوە گەشتووەتە ئاستێی وا کە فکرەکە وەك شەرع و ڕەسەنێتی سەیر بکرێت، دواتر دەرکەوتووە خواستێکی شەخسی وەیان نەزانی لە پشتەوە بووە.

ئەوەی لەو چەند پاراگرافەی سەرەوەدا ئاماژەمان پێکرد هەڵوێستەیەکی مێژوویە لەسەر فکر کە بەبڕوای من شایستەی لێ وردبوونەوەو جیاکردنەوەیە لە دەقە ڕەسەنە شەرعیەکان.

دەتوانین بڵێین و بگەیەن بەو ئەنجامەی کە فکر تواناو سەلیقەی مرۆڤەکانەو دەکرێت ڕاست و ڕاسترو وە بە پێچەوانەشەوە بێت، وە کاتێك فکر پشت دەبەستێت بە قورئان زۆر تولەڕێگەو لاڕێگەی نیشانی مرۆڤەکان داوە کە شایستەی خۆ ماندووکردن نین، وە زۆر شا ڕێگەی نیشانداوە کە ڕێگە دوورەکان کورت دەکاتەوە، کاتێك پشت بەو دەقانە دەبەسترێت لە هەر زەمەن و مەکانێکدا یان لەو چوارچێوەدا بێت ئیتر مەرج نی یە





سەرچاوەکەشی دیاری کرابێت ئەوا لەوێدا فکرەکە زیاتر بەرەو پێشچوونی بەخۆیەوە دیوە، وەك لە هەندێك یاسای ئەورووپیدا ئێستە دەیبینین.

لێرەدا دەچینە ناو چەند وردەکاریەکی قورئانەوە کە بە حەڵاڵ و حەرام لە قورئاندا هاتووە یان بە شێوەی فەرمان و ڕێگری و ڕێنموونی کراوین لەسەری...

لە قورئاندا ڕیبا، دزی، ڕێگرتن،فێڵکردن و غەش وە زۆر شتی تر کە وەك بنەمای پاراستنی ئابووری گشتی یان بە مانای مەقاصیدی حفض المال پاراستنی ماڵ هاتووە لە شەریعەدا، کاتێك فکر ئەمانەی لەلا یەکلا دەبێتەوەو وازی لێ دەهێنێت بەرژەوەندی ماڵی گشتی تێدا دەپارێزرێت، بە پێچەوانەوە کە دێت و فکری خۆی لەم بوارەدا گەڵاڵە دەکات و ئەم بنەما جێگیرە قورئانیانە پشت گوێ دەخات دەبینین تەنها چینێکی سەرمایەدار یان سیاسی و سەرمایەدارەکان تێیدا سودمەند دەبێت و هەژاری و نا دادگەری زۆر بڵاو دەبێتەوە، وەك لە دونیای سەرمایەداریدا ئێستە دەیبینین و کۆمەڵگە بارکێشی چینێکی کەمی دیاری کراوە، بە جۆرێك لە جۆرەکان کۆیلە بوونە لە بەرگێکی مۆدێرنەدا.

لە قورئاندا بنەما ئەخلاقیەکان پایەی قوڵ و پتەوی بۆ دانراوەو ئەسڵ زەواج و پاراستنی خێزانیە، کاتێك ئەم پایانە پشت گوێ دەخرێت شارستانیەت دەخاتە ژێر پرسیارەوەو بەجۆرێك مرۆڤەکان قێز لە مرۆڤ بوونی خۆیان دەکەن وەك دەبینین: ژن لە ژن و پیاو لە پیاو هەتا ژن یان پیاو لە ئاژەڵان مارەدەکەن.

گشت بنەما جێگیرەکان لە قورئاندا ئەوەی کە ئیجتیهاد هەڵناگرێت جێگەی ئەوە نی یە فکری بەشەریەت تێیدا کاربکات، گەر بێت و پشتگوی خرا هیچ جۆرە فکرێك ناتوانێت لەو باشتر بهێنێت، چوون ئەسڵەن بوارەکە ئەو بوارە نیە بچێتە چوارچێوەی پێشکەوتنەوە.

سەیری قورئان و بنەما جێگیرەکان بکەو بەراوردی بکە بە فکرە هەتا زۆر پێشکەوتووەکانی دونیاوە هیچی لەو باشتری نەهێناوە، چوون ئەوانەی لە قورئاندا



جێگیر بووە، شت گەلێك نین گۆڕینینان ببێتە مایەی داهێنان و سودی بەشەریەت، بە پێچەوانەوە گۆڕینەکەی دواکەوتووی بەرهەم دەهێنێت.

بۆ نموونە (الله جل جلاله) جێگیرە بۆ پەرستن، کە وازت لێ هێنا لە یەك خواوە کە(الله)یە ئەوەندە خواکان زۆر دەبێت پێویستی بە بودجە دەبێت بۆی سەرف کەیت! لەمەشدا هەر هەژارەکان زەرەرمەند دەبن و توانای خوایەکیان دەبێت بیکڕن کە زۆر بچوك و لە مادەی خراپ دروستکرابێت! کە من بۆ خۆم زۆر سەفەرم بە وڵاتاندا کردووەو لەگەڵ خاوەن دینە جیاوازەکاندا ژیاوم نموونەی زۆرم لایە کە هەتا تێیدا هەبووە خوای خۆی بە دیاری پێداوم! لێرەدا بۆ ئەوەی بە سوکایەتی لێك نەدرێتەوە ناوی دینەکان ناهێنم...

قورئان بواری فکرو توانای بەشەریەت و ئەو ئەرکەی کە لەسەریەتی ئاسانکردووە، وەك ئەوە وایە لە جێگەیەکدا بۆ کەسێك ١٠٠ بلۆك هەبێت بۆ گواستنەوە کە دەبینێت ٧٠ بۆ ٨٠ بلۆکی گواستراوەتەوەو ئەرکی سەرشانی سوککراوە، جا گەر مرۆڤەکان بڵێن نا ئێمە دەمانەوێت هەر خۆمان بیگوازینەوە دەبێت ئەو ٧٠ بۆ ٨٠ بلۆکە هەڵگرن و بیبەنەوە جێگەی خۆی و دیسان هەمووی بگوازنەوە، وەك بواری فکری بەشەریەتیش هەر ئەو لە سەدا بیستەی بۆ دانراوە دواتر دەبینێت خۆی دەپرووکێنێت و ناگات بە ئەنجامیش، چوون لە بری گواستنەوەی ٢٠ بلۆك باری شانی خۆی قورس کرد بۆ ١٧٠ بۆ ١٨٠ بلۆك...

ئەم ئارگومێنتەی کە ئێمە لێرەدا بەرەو قوڵیمان برد ئێرە جێگەی نی یەو دەکرێت کتێبی لەسەر بنووسرێت و وە زانایانی ئیسلامیش زۆریان لەسەر نووسیووە، وەك کتێبەکانی بواری مقاصد، یان کشف الشبهات وە بێگومان کتێبە فکریەکانیش، تەنها مەبەستمان پێی دەرکەوتنی هەندێك لەو ڕاستیە جێگیرانەیە کە لە قورئاندا هەیەو فکری ئیسلامی لێی سودمەند بووە، هەندێك جاریش حەقی خۆی پێ نەداوە، جا لەو جێگەی کە حەقی خۆی پێ نەداوە بووەتە گرفتە دونیایەکان و لە بەرانبەردا فکری تر تەنها لە ڕووی فکرەوە خوێندنەوەی بۆ ئەو کردارانە کردووە، قورئان و دەقە جێگیرو بەسوودەکان لە کاتێکدا



کەسانێك بەناوی دین یان قورئانەوە کارگەلێکیان کە کردووە فکرە دژەکان بەبێ گەڕانەوە بۆ دەقەکان هەموویان پێکەوە پۆلێن کردووە.

فکری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا تا نزیك بوو بێت لە قورئانەوە زیاتر خزمەتی بەشەریەتی کردووەو کەمتر کەوتووەتە کێشەوە، وە کە کەوتبێتە کێشەشەوە هەتا کوشتاریشی تێ کەوتبێت بە قورئانەکە چارەسەری کردووە، یان بە مانایەکی تر ئالیەتی چارەسەرەکە لەو بەشەدایە کە گواستراوەوە وەك وتمان لە سەدا حەفتا بۆ هەشتاکەیە، وەك قورئان ئاماژەی پێکردووەو دەفەرموێت:

**(وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ)** الحجرات ٩

ئەگەر دوو دەستە، یان دوو تاقم لەموسوڵمانان بوو بەشەڕیان، ئەوە دەستبەجێ هەوڵ بدەن ڕێکیان بخەن و ئاشتیان بکەنەوە، خۆ ئەگەر لایەکیان هەر دەستدرێژی دەکردە سەر لاکەی تر، ئەوا ئێوە بەگژ ئەوەیاندا بچن کەستەم و دەستدرێژی دەکات،، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا ... جا گەر لایەنە سەرکەشەکە بۆ فەرمانی خوا سەری دانەواند، ئەوە ئێوە ناوبژیوانیکی دادگەرانە لە نێوانیاندا بکەن و دادپەروەری ئەنجام بدەن، چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کەدادپەروەری ئەنجام دەدەن .(تەفسیری ئاسان)

خوای گەورەش سروشتی مرۆڤەکانی وا دروستکردووە کە پێویستی بە فکرو بیرکردنەوە هەبێت، لە قورئاندا چەندین دەقمان هەیە پێویستی بە تەفکیری زانست و هەتا زۆرجار ئامێری پێشکەوتوو هەیە بۆ گەشتن لێی.

فکری ئیسلامی بە درێژای مێژوو پێویستی بە نوێ بوونەوەو فراوان بوون هەبووەو قورئان ئەقڵیەتەکانی بۆ جوڵاندووە، ئەو ساتەی کە ڕۆحەکان پاڵفتەی زیاتر بووبن بە قورئان زیاتر فکرەکان ڕاستیەکانیان پێکاوەو هەوڵەکان زیاتر ڕۆشتووەتە خزمەت بەشەریەتەوە، تا ڕۆحیەتەکانیش ئەو نەخۆشیانەی تێکەڵ بوو بێت کە قورئان ڕەدی



کردووەتەوە بۆ خۆیان و بۆ دەوروبەرو بۆ دینەکەش هەر بارگرانی بوون، لە کۆندا نموونەی ئەمە هەیەو تا ئێستەش بەردەوامی هەبووەو زۆر نەخۆشی پێویستی بە چارەسەرە بۆ ئەوەی جەستەیەکی تەندروست هەبێت بۆ فکرو کارکردن.

مەدرەسە فکریە ئیسلامیەکانیش گەر لە چوارچێوەی دەستەڵات بوو بێت یان حیزب وە هەتا تاك ئەوەندەی زیاتر لە قورئانەوە نزیك بوو بێت بەقەدەر ئەوە لە بوارە فکریەکەدا سەرکەوتوو بوون، ئەوەندە لادانیان بوو بێت شکست لەوێوە دەستی پێکردووە، هەش بووە هەر تەنها ناوەکە دینی بووەو ئەقڵەکە زۆر لە ڕۆح و ناوەرۆکی قورئانەوە دوور بوون.

گرنگی فکری ئیسلامی زیاتر لەو کاتەوە سەرچاوەی گرت کە خەلافەتی لەدەستداو بوو بە سزایەکی خوای بۆ ئومەتی ئیسلامی و وە بەردەوامیش دەبێت تا ئەو کاتەی پابەندیان بۆ قورئان دوویات دەکەنەوەو لە نەخۆشخانەی قورئان چارەسەری نەخۆشیەکانیان دەکەن، بە جەستەی ساغەوە فکر فراوانتر کار دەکات و ڕاستیەکان دەپێکێت، کە جەستەش ئازاری هەبوو لەتاو ئازاردا پێش چارەسەر فکر بە لاڕێدا دەبات، ئەوەی کە جێگەی هەڵوێستەکردنە ئێستە لەبواری فکری بەشەریەتداو هەتا فکری ئیسلامیشدا گشت کارەکان دەدرێت بەدەست کۆمەڵگەو وە ئەنجامی هەڵبژاردن فکریشی لەسەر بونیاد دەنرێت، ئەمەش گەرچی بەشێکی زۆری ڕاستی تێدا بێت بەڵام دوورە لە ڕۆحی قورئان و بنەما پێویستی و بەرژەوەندیە گشتیەکان، چوون دەکرێت گشت کۆمەڵگە دەنگ بە شتێك بدات و ببێت بە یاسا بەڵام لەگەڵ قورئاندا پێك نەیەتەوە ئەوکات کۆمەڵگە بەخۆی بزانێت یان نە باجدەری ئەو ئەنجامە دەبێت، وەك گشت ئەو فکرانەی کە لەگەڵ بنەماکا نەگۆڕەکانی قورئاندا پێك نایەن و کۆمەڵگە تێیدا بەدەستیەوە گیری خواردووە.

*** د عومەر عەلی**

**مامۆستا لە زانکۆی لەندەن بۆ زانستە مرۆڤایەتیەکان وە بەرپرسی بەشی پەیوەندیەکانی دەرەوە.**

**www.omarali.co.uk**





# ئـــيـــســــــــــــلام و ئـــــــــــــــازادی

د.راشد غەننوشی

و .جەميل عوسمان

لەبارەی ئازادی و ئيسلامەو ئەوە تێبينی ئەكرێت كە ئيسلام ناكۆكەلەگەڵ ئازادی،چونكەئاين لەسەر بەندايەتی بۆ خودا ڕاوەستاوە،((وماخلقت الجن والانس الا ليعبدون))الذاريات56)،بەلآم ئازادی دژی بەندايەتيە(العبوديه)،ئەم بۆچونە هەندێك لە موسڵمانانی والێكردوە كە بلێن :لەئيسلام دا ئازادی نيە،بەلآم ئەگەر لەباسەكە ورد بينەوە ئەبينين كەئيسلام لەسەر ئەرك پێسپاردن((التكليف)) ڕواەستاوە،تەكليفيش بەمەرج گيراوە دوو شتی تێدابێت،ئەوانيش عەقڵ وئازادی ين،وەك زانايانی ئوصول ئەڵێن:ئازادی وئيختيار مەرجی تەكليفە.

ئەوەش لە ڕێزلێنانی خوداوە بۆ ئينسان سەرچاوەی گرتوە،((ولقد كرمنا بنى ادم))الاسرا 70)،ئەم تەكليف وتەكريمە خواييەش وائەكات مرۆڤ خاوەن ئيرادە و ئيختيار بێت وەك چۆن خودا بەفەرمودەی خۆی ڕۆشنی كردۆتەوە : (لااكراه في الدين)البقر256)، (افانت تكره الناس حتى يكونوا مؤمنين)(يونس99)،((فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر)) (الكهف29)،بێگومان كاری جێنشينايەتی نابێتە بەندايەتی مەگەر بەئەندازەی ئەوەی مرۆڤ خاوەن ئيرادەوئازادی ووشياری و بەرپرسيارێتی بێت،لێرەدا ناكۆكبونی ڕواڵەتی نێوان ئاين و ئازادی هەڵئەوەشێتەوە،بگرە ئازادی لەخودی خۆی دا ئەبێتە مەرجی دينداری.



جیاوازی نێوان ئازادی مرۆڤ و ئازادی سەرجەم بونەوەرەکانی گەردوون لەوەدایەکەمرۆڤ ئیختیاری هەیە وسەرپشکە،ئەوەش بالآترین گوزارشتەلەئیرادەیەك کە مەرجی ڕاستەقینەیە لەبوونی ئیختیار بۆ مرۆڤ، ،بەجۆریك کە وەحی خودایی ڕێنوێنی ئەکات و هیوای پێدەبەخشێت وزەمینەی بۆ ئەڕەخسێنێت،تاوەك ئازاد وقوتار بێت لە گیرۆدەبون وبارمتە بوونی واقیع و هەستێت بەئەرکی ئاوەدانکردنەوە بە گوێرەی مەنهەجی بەندایەتی،بۆئەوەی بەرژەوەندی مرۆییەکانی لەگەڵ ڕەزامەندی خوادا کۆ بکاتەوە.

لەبەر ئەوە مرۆڤ هەتاوەك زیاتر بەندایەتی بۆ خوا ئەنجام بدات زیاتر بالآ ئەکات و ئازادی بەدەست ئەهێنێت،بەڕاستی پاپای مەسیحی گوزارشتی لە نەزانی خۆی کردلەبارەی ئیسلامەوە،کاتێك ووتی ئیسلام دژی عەقڵ وئازادیە،هەموو ئەوەی لە ئیسلام دایە مەعقول وئازادە، چونکە ئاینێکە خودای زاناوکابەربەجێ سەرچاوەکەیەتی،چۆن ئەبێت داناو کاربەجێ کاری بێ حیکمەت ئەنجام بدات.

**ژن و ئازادی:**



ئازادی بناغەیە بۆ هەرییەك لەپایەکانی ئاین،وە ئافرەت(ژن) یەکێکە لەو پرسانەی کەجەخت لەو ڕاستیە ئەکاتەوە،بناغەی ئەوەش لەبەرز ڕوانینی ئیسلام دایە بۆ ئافرەت لەئاستێکی بالآدا،کە بەرلە مێینە بونی وەك مرۆڤ ئەیناسێنێت،قورئانیش



گوزارشتی لەو ڕاستیە کردوە وەك ئەفەرمێت: ( ولقد كرمنا بني ادم)، ئەو تەکریم وڕێزلێنانەش مێینەبوون و نێرینە بوون ناناسێت، چونکە نێرینەو مێینەبوون تەعبیر لە ڕەگەزی مرۆڤ ئەکات کە بەشێکە لە بوونی لەکاتێکا ئیسلام بۆ کۆی مرۆڤ ئەڕوانێت کە پێکهاتەیەکە لە ڕۆح وجەستە،چونکە بەشت کردنی مرۆڤ لەبەهاو نرخی دائەبەزێنێت و نەناسینی مرۆڤە وەك تاك و ئەوکەرامەتەی کە خوا پێی داوە.ئەوەش بنەمای یەکسان بوونی نێوان ئافرەت و پیاو ڕائەگرێت لە بەهای مرۆیی دا،ئافرەتان لەت و بەشێکن لە پیاوان،بەپێی فەرمودەی دروست،ئەم گەردوونە لەسەر یاسای زەواج ڕاوەستاوە،ئەوەش بەپێی فەرموودەی خوای گەورە (ومن كل شيء خلقنا الزوجين لعلكم تذكرون)،ئەو هاوسەر بوون و زەواجەش هەماهەنگی و یەکسان بوون و تەواو کاری ئەخوازیت،بۆیەلەکاتی کوشتنی ئافرەتێکا داوا ناکرێت ئافرەتێکی تر بکوژ رێتەوە تاوەك سزاکە یەکسان دەربچێت ،چونکە بکوژ گیانی مرۆڤێکی دەرکردوە کەکەمترنیەلەو.

تەنها ئەوەندە هەیە کە ئەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان یەکسان بوون ولەیەك چوون ،لەبەرئەوە ڕەچاو کردنی تایبەتمەندی بەشێکە لەپێداویستیەکانی کەرامەتی مرۆڤ،لەسادە ترین مافەکانی ژن لەیەك کاتا ، ڕۆڵی دایکبوونە کە بە پیاو قەرەبوو ناکرێتەوە،ئەوە تەنها جێبەجێکردنی وەزیفە نیە،بەڵکو ئامادەگی و قابیلیەتی دەرونیە بۆ تێرکردنی خواستە مادی و ڕۆحی و سۆزداریەکانی منالێ،ئیسلام بەم وەزیفە وئەرکەی ژن لە دابەشکردنێکی کۆمەڵایتیەوەئەباتە ئاستی پابەندبوون،تاوەك ئەوە لە ئافرەتدا دروست بکات کە لەزەرورەتەوە بگوازێتەوە بۆ کردار ،ئەوەش لە ڕێگای وێستگەیەکی ئیمانیەوە کە خزمەت و کاری ژن بە پاداشتەوە گرێ ئەدات،وەك چۆن لەفەرمودەی پیرۆزدا ئەڵێت: (الجنه تحت اقدام الامهات) .بەهەشت لەژێر پێی دایکانایە .

ئەمە ڕۆحی ئیسلامە لەمەر پرسی ژن،ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ژن لە مێژووی ئیسلامی دا ڕوبەڕووی ستەم نەبوبێتەوە،ستەمی مێژوو لەژن خۆی لەوەدا ئەبێنیەوە کە کچ بۆ زەواجەوکاری ناوماڵە تا کار گەشتە ئەوەی کە ڕێگری لەئافرت بۆ مزگەوت دەزگامەعریفی و زانستیەکان بکەن،بەڵام کوڕ ئەبێتە پیاو بۆیە ئەتوانێت بخوێنێت و فێربێت تاوەك کۆتا قۆناغەکانی زانکۆش بڕوات،سەرەڕای ئەوەی خوای گەورە ڕێزی لە مرۆڤ گرتوە بە ڕەهایی و ئەرکی پێ



سپاردوە بەگشتی کەچی ئەبینین لە مێژوودا ئافرەت نە وەك مرۆڤ و نەوەك جنۆکەش حیسابی بۆ نەکراوە.

**دەستەڵات و گرەنتیەکانی ئازادی:**

لەڕاستی دا ئیسلام تەنها بەندایەتی و ڕەوشت و مامەڵە (عیبادات و اخلا و معاملات) نیە،بەڵکو بەرنامەیەکی تێرو تەسەل و گشتیرە بۆ ژیان، لەبەر ئەوە موسڵمانان داوا لێکراون بەدانانی سیستەم ورێسایەك بۆ حوکمڕانی ،عوسمانی کوڕی عەفان وتویەتی (ان الله لیزع بالسلطان مالا یزع بالقران)، واتە خودا ئەوەی بەفەرمانەڕوا چاك و ڕێکی ئەخات بە قورئان نایکات،بۆیە پێغەمبەر دخ هانمان ئەدات لەسەر کاری بەکۆمەڵ،وە ئەوەی پەرگیری بکات لەکۆمەڵ ئەوە بەرەو ئاگر پەرگیر بوە.هەروەها ئەگەر چوینە سەفەر ئەبێت کەسێکمان بکەینە دەمڕاستی خۆمان،بەلأم خواستی ژیانی مرۆڤایەتی بۆ نیزام و ڕێکخستنی پاساو ناداتە تاکڕەوی ،بەڵکو بەشداری ئەکاتە مەرج بۆئەوکارە،ئەوەش لە ڕێگای شوراو ڕوایژپێکرنەوە.

بەم مانایە سیستەمێك لەسەر ئیختیار و بەشداری و شورا ڕاوەستابێت ئەو سیستەم و یاسایە ئیسلامیە،هەروەها هەر سیستەم ویاسایەك لەسەر تاکڕەوی ڕاگیرابێت ئەوە فیرعەونیە،چونکە ئیسلام ڕەمز و هێمایە بۆ کاری دەستەجەمعی ودادپەروەرانە،وەفیرعەونیەتیش ڕەمزە بۆ سەرکوتکاری و دیکتاتۆری و خۆسەپاندن لەزەوی دا لەسەر حیسابی ئەوانی تر ،هەروەك چۆن قورئان تەعبیری لێکردوە.

لەڕاستی دا فیرعەون هێمایە بۆ شێواز و کەلتورێك نەك بۆ ناوێك،هیچ کەس نازانێت ناوی پاشاکەی میسر چی بوو،بەلأم هەموان ئەزانن فیرعەونیەت یانی چی.

بێگومان حوکمڕانی بەبێ هەڵبژاردن شەرعیەتی نیە،وە ئیسلام بناغەی دیموکراسی داناوە و خۆرئاوا لەئیسلامی وەرگرتوە،هەروەك نمونەی خیلافەی ڕاشیدین نمونەی حوکمڕانی و دەستەلأتێکە کە شەرعیەتی لە ڕای گشتیەوە وەرگرتوە،ئەو ڕاستیەمان لە وتارەکەی ئەبوبەکر خ ڕ دا ئەدۆزینەوە کە ئەڵێت: (لقد وُلیتُ علیکم ولستُ بافضلکم) واتە من کرام بە کاربەدەستتان و لەئێوەش باشتر نیم،ناڵێت من دەستەلاتم گرتە دەست بەهێزی بازوو کودەتا،بەڵکو ئەڵێتك کرام

بە کاربەدەستتان،کەواتە خەڵك: لەڕێگای شوراوە شەرعیەتیان پێداوە،هەروەها لە وتارەکەی عومەر خ ڕ دا کە ئەڵێت: (اطيعوني ما اطعت الله فيكم)، واتە گوێڕایەڵیم بکەن ئەوەندەی من گوێڕایەڵی خوا ئەبم،ئەوەش بریتیە لەوەی کە پرۆسەی بەیعەت پەیمان و عەقدێکی مەرجدارە ،نەك وەلا ءو خۆشەویستی بۆ فەرد و دەستەلاَت.

پاشان ئیسلام لە ئاستێکی بەرزدا بەرپرسیارێتی مانائەکات ،وتەکەی پێغەمبەر دخ کە ئەفەرمێت: (كلكم راع وكلكم مسؤل عن رعيته)،وادەکات کۆمەڵگە سەربەخۆ بێت و ببێتە هێزی چاودێری بەسەر دەستەلاَتەوە.

هەندێك لە هاوەلاَن نمونەی ئەو ڕاستیەن لەوانە بیلالی کوڕی ڕەباح کاتێك ئیسلام لە کۆیلەیەکەوە ئەیکاتە هاولاَتیەك خاوەن ماف و هەست و کەرامەت و بەرپرسیارێتی ،پاشان ژینگەی ئازادی وائەکات ئافرەتێك لە بابەتی مارەیی دا ڕوبەڕوی عومەر بێتەوە و خەلیفەش لە بۆچونەکەی پەشیمان ببێتەوە کە وتبوی با مارەیی ئافرەتان کەم بێت،چونکە زانی ژنەکە بەڵگەی بەهێز ترەو هیچ هەستی بە شکاندن و نەنگیش نەکرد،جارێك عومەر پرسیار لە خەڵکی ئەکات و ئەڵێت من پاشام یان خەلیفە؟ لەوەلاَم دا ئەڵێن: ئەگەر ماڵ وسامانت بە حەق گرتبێتە دەست و بەحەقیش لەشوێن خۆی دایبنێیتەوە ئەوا خەلیفەی،بەلاَم ئەگەر بەناحەق وەرت گرتبێت و سەرفی بکەیتەوە ئەوە تۆپاشای.

پاشان حوکمڕانی بەخیلافەت ناو ئەبرا نەك مەلەکی-پاشایی- لەبەر ئەوە تاکڕەوانە نەبوە،بێگومان هاوەلاَن خیلافیان ئەبوو بەلاَم جیاوازیەکانیان بە ڕۆحیەتێکی بەرز و بەرپرسیارانە لەبەردەم ئەرك دا بەڕێ ئەکرد.

لەبەر ئەوە کاتێك پۆستی خەلافەت بۆ عەلی کوڕی ئەبوتالب- خ ڕ -ئەخرێتە ڕوو بەمەجەرج ئەگیرێت لەسەر مەنهەجی دوو خەلیفەکەی پێش خۆی بڕوات،بەلاَم ئەو بەومەرجە قبوڵی ئەکات کەپابەندی مەنهەجی قورئان وسونەت بێت،ئەوەش بەو مانایە نەبوە کە بڕوای بە دوو خەلیفەکەی پێش خۆی و مەشروعەکەی ئەوان نەبوبێت،بەڵکو بڕوای وا بوو کە مافی ئەوەی هەیە بە گوێرەی



تێگەشتنی خۆی لەپەیامی وەحی و لە واقیع بڕوانێت،ئەم هەڵوێستە گوزارشتە لە مەنهەجێك کە بەرەوە فراوانبونی بازنەی ئیجتیهاد هەنگاو ئەنێت،نەك تاکڕەوی و خۆسەپاندن.

پێغەمبەر دخ هاوەڵەکانی لەسەر کاری بەکۆمەڵ پەروەردە کردبوو،خوای گەورەش شایەتی ئەو ڕاستیە ئەدات و ئەفەرمێت: (لو انفقت مافي الارض جميعا ما الفت بين قلوبهم ولكن الله الف بينهم) اللانفال63،بێگومان ئومەت و گەلێك لەو ئاستە بەرزەی متمانە وبەرگریەدا بێت لەتوانایدا هەیە هاوسەنگی نێوان دەستەڵات و کۆمەڵگا بێنێتەدی،وەك چۆن لە بونیاتنانی نیزام و حوکمڕانی دا ئەتوانێت جیاوازیەکان لە خۆ بگرێت وقبوڵ بکات،کودەتاکەی ئەمەویەکان نەیتوانی ئەو هاوسەنگیە لەناوبەرێت،بەڵام سنورداری کرد،بۆیە سەرەڕای کودەتای پاشایەتی و بنەماڵە بەسەر حوکم و نیزام دا لەمپەر نەبو لەبەردەم فرەیی و هەمەڕەنگ(پلۆرالیزم)ی سیاسی و فیکیری دا،وە دەستەڵاتی ویراسی نەیتوانی کۆمەڵگای خاوەن موڵکی گشتی کۆنترۆڵ بکات، وەك چۆن دامەزراوەی فێرکردن (مؤسسة التعليم) وەك خۆی مایەوە،بۆیە ئەبینین دەوڵەتی ئەمەوی لەسەر مەزهەبێك بوە و عامەی ئومەتیش لەسەر مەهەبی موخالیفی ئەوان بوە.

ئەمە ڕۆح ی ئیسلامە کە ئازادی بەرز ڕادەگرێت،ئەوە جەماوەرە کە بە پێی بەرنامەو سیستەمێك هەڵئەبژێرێت وموماڕەسەی چاودێری و لەکارلادانی بەرپرسان ئەکات ،ئەبینین بەم پێوەرە ئەمرۆخۆرئاوا لە ئیسلام نزیك ئەبێتەوە و موسڵمانانیش دوور ئەکەونەوە.

**ئابوری وئازای:**

لێرەدا ڕەهەندێکی تر هەیە کە تیایدا مانای ئازادی لە ئیسلاما ئەدرەوشێتەوە،ئەویش لایەنی ئابوریە،زەکات تەنها بەندایەتی نیە،بەڵکولەگەڵ بەندایەتی دا چالاکیەکی کۆمەڵایەتی و ئابوریە لەیەك کاتا، جگەلەوەی زەکات جوڵەیەکی ئابوریە لە ڕێگەی دەستاودەست کردنی سامانەوە،لەهەمان کاتیشا جیاوازیە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان چین و ڕەگەزەکان کەم ئەکاتەوە بەوشێوە ی کە لەسەر نەهجی ئیسلام ڕاوەستاوە،لەئیسلام دا موڵکداری تەنها بۆ خودایە،مرۆڤ تەنها جێنشین و ئەرك پێسپێردراوە و پاشان موحاسەبە ئەکرێت لەسەر باش یان خراپ مامەڵە کردنی بەو سامان و موڵکەی لەبەر دەستی بوە ،بێگومان ئیعتیباری موڵکیەت بۆ خودا مرۆڤ لە





بوون بۆ کۆیلەی دینار و دراو ئازاد ئەکات و چیتر لەبری ئەوەی گیرۆدەی لۆژیکی سود و پێویستیەکانی خۆی بێت،بالاٌ ئەکات بۆ ئاستێك کە ئەخلاق ببێتە پشك و یاوەری.

لەئیسلام دا سەروەرت و سامان لەچنگی کەمینەیەك دا قۆرخ نابێت،وەك چینێك یان دەولەتێك یان فەردێك،بەلکو دان بەماف هەموانا ئەنرێت بۆ بوون بەخاوەن مولك ،ئەوەش بەپێچەوانەی نیزامی سەرمایەداریەوە کە ڕێگاخۆش ئەکات بۆئەوەی کەمینە و کۆمەلە کەسێك تەواوی سامان ومولك قۆرخ بکەن بۆ خۆیان،وەپێچەوانەی شیوعیەتیشەوەیە کە سەروەت و سامان کۆئەکاتەوەو ئەیخاتە ژێر دەستی دەولەت.

مێژووی ئیسلام نمونەیەکی ناوازەی لەبارەی مولکداریەوە پێشکەشکردوە،ئەوەیەکە بە ئەوقاف ناوئەبرێت،ئەوە یەکەم جێبەجێ کردنی کردەییە بۆ مولکداری سامانی گشتی لەلایەن کۆمەلگاوە،نەك لەلایەن دەولەوتەوە،بۆیەکەم جار مێژوو ئەوە بەخۆیەوە ئەبینێت کە مولك و سامانی گشتی لەدەرەوەی بازنەی دەولەوت یاخود فەردەوە مامەلەی پێوە بکرێت،لەسیستەمی ئەوقاف دا هەموان ڕێگاپێدراون سوود لەمولك وەربگرن،بەلاٌم هیچ کەس بۆی نیە مامەلە بە مولکی وەقف بکات،واتە ببێتە خاوەنی مالٌ و سامانی وەقف کراو.

بێگومان سیستەمی ئیسلامی ڕەهەندەکانی ئەخلاق و قازانج وسوود کۆئەکاتەوەو،ڕەچاوی لایەنی دەرونی وکۆمەلاٌیەتی ئەکات،بەو شێوەیەش هەموو ڕکابەری (المنافسە) یەکی نائەخلاقی لە مرۆڤایەتی دوور ئەخاتەوە،هەرئەوەش بوو کە مێژووی ئیسلامی لە نەنگی و ناشیرینیەکان پاراست وەك بازرگانی کردن بە جەنگ و مرۆڤ و قڕ کردنی بەکۆمەلٌ بەناوی شارستانیەتەوە،ئەوەش بۆ پەردەپۆشکردنی ئەو دزی و خوێنمژین و سامان هەلٌلوشینەی کە خۆی لە خۆشگوزەرانی ولاٌتانی زلهێزی ئەمڕۆ و سبەینێیەکی نزیکیا ئەنوێنێت.

لەلایەکی ترەوە ئیسلام هاوسەنگی نێوان لۆژیکی حەق و لۆژیکی ئەرك ڕائەگرێت،وەك نمونەی هاوەلاٌن کە ئیسلام ڕۆحیەتێکی خۆڕاگری وەهای تیادا دروست کردبوون کە ئازادی کۆمەلاٌیەتیان ئەسازان،ئەوەش لەڕێگەی ڕەتکردنەی هەر جۆرە کەناردان و پەراوێزخستن و فەرامۆشکردنێکەوە،ئەبو زەڕی غەفاری ئەو هاوەلە بەڕێزەیە کە ئەکرێت بە یەکەم مرۆڤی



ئیشتراکی لەمێژوودا دابنرێت،لەڕاستی دا ئەو کەسایەتیە ڕۆژێك لەڕۆژان ستایش ی دەستەلآتی نەکردوە،ئەو لەسۆنگەی عەقیدەو باوەڕێکەوە ئەوشۆڕشەی برپاکردبوو کەمرۆڤی لەسەر خاکی بوون گەورە ئەکرد،عەقیدەیەك کە هاوەڵی وا دروست ئەکات بڵێت : (سەرم لەکەسێك سوڕ ئەمێنێت کە بژێوی ڕۆژانەی دەست ناکەوێت ودەست ناداتە شمشیرەکەی...).

## ئازادی بیروباوەڕ و کوشتنی هەڵگەڕاوە (قتل المرتد)

بابەتی هاتنە ناو ئاینی ئیسلام و دەرچوون لێی ئەوەیە کە زاراوەی پاشگەزبو (الردە) ی لێنراوە،چونکە کاتێك مرۆڤ ئەبێتە مورتەد–پاشگەز–بوو لە دین کەپێشتر هاتبێتە ناوئیسلام،ئەو ڕوداوەش لە دوای وەفاتی پێغەمبەر دخ ڕووی دا کاتێك هەندێك هۆزی عەرەبی پاشگەز بوونەوە،لەوبارەوە خیلاف–ناکۆکی– کەوتۆتە نێوان ئەبوبەکری صدیق و عومەر،ئەوەبوو ئەبوبەکر



وتی ئەبێت لەگەڵیان بجەنگین،عومەریش وتی چۆن شەڕی خەڵکانێك ئەکەیت کە ئەڵێن (لا الە الا اللە)،ئەبوبەکر وتی سوێن بەخوا هەرکەس نوێژ و زەکات لەیەك جیابکاتەوە من لەگەڵی ئەجەنگم،عومەر ئەڵێت ئەبوبەکر بەردەوام بو لەسەر قسەکەی تاوە ك قەناعەتی پێکردین،لێرەدا ئەبوبەکر هێزی دەوڵەتی بەکار نەهێنا،بەڵکو هێزی بەڵگەو یەقینی بەکارهێنا،پاشان ئەوەی ڕووی دا هەڵگەڕانەوە نەبوو لە دین بەڵکو یاخی بوون بوو لە دەوڵەت،وە مافی هەر دەوڵەتێکەکە لەبەرامبەر هەر کۆمەڵەو گروپێکا کە ملنەدا بۆ پێدانی باج بەدەوڵەت کە هێزی یەکلاکەرەوە و تەمبیٚ کردن بەکار بێنینت،بەتایبەت ئەگەر ئەو گروپ و تاقمە پەنا بۆچەك بەرێت بۆ نەدانی باج،لەڕاستی دا پرسی مورتەد سیاسیە و عەقائیدی ودینی نیە،لەبەر ئەوە ڕاجیایی کەوتۆتە نێوان زاناکان،هەندێ: سزای کوشتنی مورتەدیان بە سزای تەمبیٚ کردن و ترساندن (عقوبە تعزیریە) داناوە،هەندێکیش بە سزای حەد و شەرعیان داناوە،هۆکاری ناکۆکی زانایان بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە کە دەق و بەڵگە لەبەردەست نیە تاوەك بە تێر و تەسەلی شێوازی



سزاکە یەکلای بکاتەوە،چونکە قسە کردن لەسەر سزای مورتەد لەدوای وەفاتی پێغەمبەرەوە ڕووی داوە،بۆیە لە غیابی دەقی گومانبڕا شرۆڤە کراوە.

بێگومان ئیسلام کەهاتوە ئازادی بوە بۆ مرۆڤایەتی ((وما ارسلناك الا رمه للعالمین)) هاتوە مرۆڤ لە ئارەزوو وشەیتان ڕزگار بکات،ئیسلام خۆڕاگری ئەبەخشێتە مرۆڤ لەدژی سەرکوتکاری سیاسی و قۆستنەوەی ئابوری و دژی جیاکاری کۆمەلأیتیە، ئەمڕۆ ئەوەی لەولأتی ئیسلامدا لەدەستمان داوە بریتیە لەئازادی،هەربۆیە موسڵمانان لە ئەوروپا داوای ئازادی ئەکەن،کۆچی موسڵمانان بۆ ئەوروپا ڕاکردن نیە لەئیسلام بەرەو کوفر، بەڵکو هەڵهاتنە لە سەرکوتکاری و ستەم بەرەو ولأتانی ئازادی و ڕێز و ئینسانیەت.

**<u>ئازادی لە ڕێگای کۆمەڵگای مەدەنیەوە:</u>**

کۆمەڵگەی مەدەنی لەئیسلام دا بە کۆمەڵێك تایبەتمەندی دەرونی و کۆمەلأیەتی و ئاکاری ئەناسرێتەوە کە مرۆڤ لە وەلائ و ئینتیما بۆ غەیری خودا ڕزگار وئازاد ئەکەن،بەجۆرێك کە خۆڕاگری و بەرگری لە مرۆڤ دا دژی هەیمەنەت و زۆرکاری وسەرکوتکردن دروست ئەکات،ئەوەش لە مێژووی ئیسلاما لە کۆمەڵێك نمونە ودیاردەدا بەرجەستە بوە،لەوانەش (المجتمع المسلم)کۆمەڵگایەکی موسڵمان بۆ دانانی دەزگاو دامەزراوەی شەعبی و سەربەخۆ و ئەهلی و دور لە دەستەلأت و دەوڵەت،کەکاریان بریتی بوە لە پێشکەش کردن و دابینکردنی خزمەتگوزاری بۆ خوێنکار و فێرخواز و موسافیر و جەنگاوەر ،یاخود هەڵنان و کارئاسانی کردن بۆ پرۆسەی هاوسەرگیری و داوێنپاکی،هەندێك لەو دەزگا خۆبەخش و ئەهلیانەی کۆمەڵگای ئیسلامی بریتی بوە لە خزمەتکردن وپاراستی ژیانی هەندێك ئاژەڵ وگیانەوەر کە نەیان توانیوە بۆخۆیان پارێزگاری لەمانەوەیان بکەن .

یاخود تەشکیل کردنی سوپا و جەنگاوەری خۆبەخش لەکاتی ناچاری و هەڕەشەدا لەلایەك خەڵکەوە کە ئەکرێت ناوی بنێین هیزی گەل (الجیش الشعبی)کە پێچەوانەی سوپای نیزامیە،هەروەها فێرکردنی ئەهلی (التعلیم الاهلی) و خزمەتگوزاری تەندروستی و کۆمەڵەی



پیشەوەران و شتی تریش کە بەهەموویان تەرازوی هێزی کۆمەڵگا دروست ئەکات و سنور بۆ دەستەڵات دائەنێـت.

کۆمەڵگای موسڵمان ئەو دەزگاو دامەزراوانەی لەپێناو دروست کردنی هێز و سەنگی مەدەنی دا دامەزراندوە،یەکێکی تر لەو دامەراوانە بریتی بوە لە دەستەڵاتی زانایان بۆ ئاڕاستەکردنی خەڵك لەکاروباری گشتی و پاراستنی پەیوەندی نێوان هەردوو لایەنی غەیب و مێژووی ئیسلام.

هەموو دەستەڵاتێك بەسروشت حەزی لە خۆسەپاندن و کۆنترۆڵ کردنی تەواوی کۆمەڵگا هەیە،دەستەلات دامەزراوە بۆ خزمەتی کۆمەڵگا،بەلاّم کاتێك ئەبێـتە خاوەن تەواوی جومگەکانی،ئەوا هەولّی ئەوە ئەدات کۆمەڵگە بکاتە خزمەتکار و ژێر ڕکێفی خۆی،وە لەڕاستیدا پێشکەش کردنی ئەو تەرحە مەدەنیەی ئیسلام هەر بۆ ئەوە بوە کە خەڵك نەکەونە ململانیٚ ی ناوخۆیان وبەناچاری موڵك و سامانیان نەخەنە ژێرچنگی دەستەلاّت و بەرپرسان،(وتدلوا بها الی الحکام....) ،خیتابەکانی ئیسلام بۆگروپێکی تایبەت نین بەڵکو گشتین و بۆ هەموانن (یاایهاالناس_یاایهالذین امنوا_) ئەوەش کە پاڵنەرێکی بەهیزە بۆ تواناو چالاکیەگشتیە کۆمەڵایەتیەکانی گەل و جەماوەر تاوەك تایبەتمەندیەکانی بپاریزێـت و وەك یەکەیەکی کۆمەلاّیەتی بنەڕەتی دامەزراو توانای گۆڕان و کردار و ئازادی بۆ مرۆڤ دەستەبەربکات.

بێگومان ئومەتی ئیسلامی بەدرێژای مێژوی ملکەچ نەبوە،ئەگەر چی لە غیابی دەستەلاّتا بوە،ئەوەشی لە ڕێگای پێکهاتەیر ۆشنبیری و کۆمەلاّیەتیەوە بەدی هێناوە،مەرجی ئازادی بە ئاستی ڕۆشنبیریەوە گریٚ دراوە،بۆیە ناکریت ئازادی وك منەتێك تەماشا بکرێت،بەڵکو لەسەر بوونی هاوسەنگی هێز ڕاوەستاو،سەرەڕای ئەوەی دەولّەتی عوسمانی حەنەفی مەزهەب بوە بەلاّم باکوری ئەفریقا مالیکی بوون،لەکاتێکا ولاّتی میسر شافیعی بوون.

پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی پرۆسەی ئازادکردنی مرۆڤایەتی بوەلە ستەم و زۆری نیزام گەلێکی جیاواز،زۆر بانگەشەی ئەوە ئەکرێت کە فتوحات ی ئیسلامی بابەتێکە لەگەڵ ئازادی دا یەکناگرێتەوە،یەك لەوانەلێدوانەکەی پاپای پێشوو ئەویش لە ئیمپراتۆرەوە نەقلّی کردبوو کەئەلّێت:



(هەمو ئەوەی پێغەمبەر محمد  هێناویەتی نەگریس ونائینسانی بوە،وەئیسلام بە هێزی شمشێر و بلاو بۆتەوە،کەواتە چی پەیوەندیەك لەنێوان فتوحات وئازادی دا هەیە؟.

لەڕاستی دا ئاینی ئیسلام لەسەر بنەمای زۆر لێنەکردن (عدم الاكراه) ڕاوەستاوە،وەك خوای گەورە ئەفەرمێت (لا اكراه فى الدين) البقره256،پاپا رەتی ئەو ئایەتە بەوە ئەداتەوە کە پێغەمبەر دخ کاتێك ئەو ئایەتەی وتوە کە لاواز بوە ،بەلاّم کاتێك هێزی پەیدا کردوە ئەو حوکمەی گۆڕیوە،لێرەدا جەهل ونەزانی پاپاکەشف ئەبێت چونکە ئەو ئایەتە مەدەنیە و ئەو حوکمەش خوا شەرعاندویەتی وپێغەمبەریش خاوەن هێز و دەستەلاّت بوەلەچاو حالّی سەردەمی مەکەدا.

بێگومان پێغەمبەر  دخ کۆمەلّگای مەدینەی لەسەر بناغەی هاولاّتی بوون  دامەزراندوە نەك عەقیدەو ئاین،بۆیە کۆمەلّگەیەکی فرەیی  لەچوار چێوەی ئازادی و یاسادا ڕێك ئەخرێت،ئەوەش لەخیلالی وەسیقەکە دەستوریەکەی  مەدینەدا ڕەنگی داوەتەوە،دەستور و سەحیفەیەك کە موسلّمان و ئەهلی کیتاب وتەنانەت مونافیقەکانیشی لەخۆ گرتبوو وە گرەنتی مافەکانی کردبوون.

بێگومان بانگەوازی ئیسلام  لەسەردەمی مەکەدا قوربانی ستەم وناحەقی بوە،وە لەسەرەمی مەینەدا قوربانی گەمارۆ و جەنگ وبوە،تەواوی جەنگەکان لە دەوروبەر و نزیکی مەدینەدا ڕوویانداوە، وەك غەزای بەدر و ئوحود وئەحزاب،ئەمەش مانای ئەوەیە جەنگەکان دیفاعی بوون نەك هجومی ،واتە– بەرگری کردن بوە نەك هێرش کردن–،ئەگەر هجومی بونایە ئەبوایە لەخاکی دوژمنەوە نزیك بونایە،وەك چۆن جەنگ لەگەلّ فارس و ڕۆم بەهۆی کوشتنی نێردراو و نوێنەرەکانی پێغەمبەرەوە بوە لەلایەن ئەوانەوە،وە ئەبینین زۆربەی ئەو گەلانەی کە هاتونەتە ئیسلامەوە بەئیختیار و ویستی خۆیان بوە،وەبەهۆی سەرسامبون و کاریگەربونیان بە ڕەوشت و زانستی موسلمانەکان،ئیتر بانگخواز بووبن یان بازرگان،خۆ ئەگەر پەیام وبانگەوازی ئیسلام بە جەنگ بسەپێنرایە ئەوا لە ولاّتی ئیسلاما جگە لەموسلّمانی تیا بەدی نەئەکرا،بەلاّم ولاّتی موسلّمانان هەرگیز خالّی نەبوە لە غەیری موسلمان،ئەوەش بەلّگەیە لەسەر سەماحەت ولێبوردەیی ئیسلام و پشت نەبەستنی  بەشێوازی زۆرلێکردن،لەدیار ترین شارستانیەتەکانی ئیسلام شارەکانی بەغداد و دیمەشق بوە،کەچی بەردەوام شوێنی پێکەوەژیان و شاری فرەیی ئاینەکان بوون،ڕۆژێك لە ڕۆژان



جەنگی دینی و یاخود کوشتن و قڕکردنی بەکۆمەڵ لەدژی ناموسڵمانەکان ڕوی نەداوە،وەك ئەوەی لە ئیسپانیا ڕویدا،کە زیاتر لەچل ملیۆن موسلمان بە کوشتن و ڕاگواستن لەناو بران،یاخود لە ئەمریکا کە زیاتر لە سەد ملیۆن مرۆڤ قڕ کران،هەروەها لەئەفریقاله گەرمەی بازرگانی سیَ قۆلّی دا نزیکەی سەد ملیۆن مرۆڤ کوژرا،ئەمە جگە لەو جەنگانەی کە لەماوەی پرۆسەی داگیرکردنا و بە درێژایی سەدەکان ڕویان داوە و زیاتر لە 70ملیۆن مرۆڤ جینۆساید کراوە، باجەنگی خوێناوی بۆسنەی نێو قولاّی ئەوروپا بوەستێت کە تەعبیر بوو لە دڕندەیی و نەبونی لێبوردەیی لەسەردەمی نویَ دا.

لەڕاستی دا پێغەمبەر دخ زۆری لەخەڵکی نەدەکرد تا شوێنی بکەون،بەڵکو بانگی ئەکرد بۆ حیوار و دیالۆگ،وەداوای ئەکرد کە ئەومافەی بدەنیَ خیتابی خۆی ئاڕاستەی خەڵك بکات وەك ئەیفەرمو : (خلوا بيني وبين الناس) لەدرێژایی مێژووی زێڕینی دا ئەو قوربانی توندو تیژی بوە،بەلاّم ئەو قوربانیدانەی بە خۆڕاگری وئارامی کردە هۆکاری بەدەستهێنانی پشتگیری و هاوسۆزی خەڵك،تەنانەت کاتێك وای ئەخواست تۆڵەلەمونافیقەکان بکاتەوە ئەو سزای ڕەتکردەوە، تاوەك عەرەب پییَ نەڵێـن: موحەمەد هاوەڵەکانی خۆی ئەکوژێت،تاوەك دەرگای کۆنە قین و تۆڵەکردنەوە نەکاتەوە،ئابەو شێوە شۆڕشەکەی پێغەمبەر دخ ئەبێتە یەکەم شۆڕشی ئاشتیخوازانە لەمێژوودا،تەنها شۆڕشێکە کە نەوەکانی خۆی نەخواردبێت بەپێچەوانەی شۆڕشەکانی ترەوە کە لەیەك کاتا نەوەکان دوژمنەکانیش دروێنە ئەکات.



# دەوڵـــەتـــی ئیـــــسلامیـــی و ئیشكالیەتی عەقڵی عەرەبیی



ن.محمد شحرور

و. ڕێبەر أكرم فائق

(محمد شحرور)،نوسەرێكی سورییە،لەدایك بووی ساڵی(1938)ی دیمەشقە،وەنوسەرێكی بەتوانای بواری نوێكردنەوەی فكری ئیسلامییە،نزیك بە نیوسەدەیە لەوبوارەدا ئەنوسێت،ئەم بابەتە نوسینێكی ناوبراوە كە بەهۆی هاوشێوەیی یان نزیكیی عەقڵیەتی عەرەبی لەعەقڵیەتی كوردی لەم ڕووەوە،وە كاریگەریی عەقڵیەتی عەرەبی لەسەر عەقڵیەتی كوردیی.

## ئایا دەوڵەتی ئیسلامی چارەسەرە؟

دیارە پرسی دەوڵەتی ئیسلامی و هاوشێوەكانی لەئێستادا یەكێكە لەپرسە بایەخدارو جێناكۆكەكان كە ڕای جیاوازو گفتوگۆی جددی لەسەرە،بۆیە لێرەدا دەپرسین ئایا دەوڵەتی ئیسلامی چارەسەرە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پێویستە سەرەتا واتای (دین) ئاین و واتای (ئیسلام) بزانین،ووشەی (دین)ئاین لەبنەڕەتدا بەواتای پابەندبوون و چوارچێوەدارییەكی ئارزوومەندانە دێت بەبێ زۆرلێكردن بە بەهاو دروشمەكانەوە،وە واتا گشتییەكەی بریتییە لەو پابەندبوونانەی كە مرۆڤ بۆ خودا دەیخاتە ئەستۆی خۆی لەڕووی دەرچوونی لە دونیای ئاژەڵێتی و ئەنجامدانی پەرستش بۆ خودا،بەڵام ووشەی (ئیسلام) لەبنەڕەتدا لەووشەی (سلم- ئاشتی) یەوە هاتووە كە بەگشتی بەمانای تەندروست بوون و سەلامەتی دێت،وە ناوی (سلام)ی خوداش بەمانای سەلامەتی خودا دێت لەهەر عەیب و كەم و كورتییەك،لێرەوە دەتوانین بڵێن كە ئاینی ئیسلام خاڵییە لەهەر هەڵەو كەم و كورتییەك وە شێوازی پابەندبوون پێوەی ئاسان و ئارەزوومەندانەیە،بەپێچەوانەی هەندێك كە پێیان وایە ئیسلام بەواتای تەسلیم بوون بەخودا دێت چونكە خودا داوای لێكردووین كە سەلامەت بین نەك تەسلیم ببین بەبێ كۆت و بەند.



ئەگەر ئەم ئایەتە پیرۆزە بخوێنینەوە[ومن يبتغ غير الاسلام دينا فلن يقبل منه فهو فى الاخرة من الخاسرين.ال عمران.85﴾ وادێتە مێشکمان وەك لەفقهی بۆماوەوە دیراسەی دەکەین کە هەموو ئەو ناموسوڵمانانەی کە لەپێش ئێمەبوون وە بەدواماندا دێن لەسەرزەوی کارەکانیان پوچ و بێ سوودە بەڵام ئەوەی بەتەواویی قورئانی پیرۆز بخوێنێتەوە دەبینیێت کە ئیسلام بە پێغەمبەر (نوح) دەست پێدەکات وەك دەفەرموویێت[فان توليتم فما سالتكم من أجر ان أجرى الا على الله وأمرت أن أكون من المسلمين.يونس.72]وە لە (ابراهيم)دا بەردەوام دەبێت[ ماكان ابراهيم يهوديا ولانصرانيا ولكن كان حنيفا مسلما وما كان من المشركين.ال عمران.67]وە (يعقوب و موسى و عيسى) كە دەفەرموویێت﴿فلما أحس عيسى منهم الكفر قال من أنصارى الى الله قال الحواريون نحن أنصارالله امنا بالله واشهد بانا مسلمون.ال عمران.52]،تەنها ئاینی ئاسمانییە کە مرۆڤایەتی ناسیویەتی وە پێغەمبەران هێناویانە بەجیاوازی پەیام و کتێبەکانیان،وە پاشان پێشکەوتن و زانیاری بەرهەمهێنەرانەی مرۆڤی لەسەر کەڵکە بووە،وە بەهاکانیش دەستیان پێکرد بە﴿رب اغفر لى ولوالدى.نوح.28﴾ کە پاشان بوارە جیاوازەکانی ژیانی گرتەوە،وە ئیسلام لەپێشترو پێشکەوتووترە لەباوەڕ(ايمان) وە بنەماکانی ئیسلام لە کتێبی خوادا بریتییە لە(باوەڕ بەخودا و بەڕۆژی دوایی و کردنی کاری چاك) لەکاتێکدا بنەماکانی باوەڕ(ايمان)وەك ئەوەی پێمان ووتراوەو دەیزانین بریتین لەوەی کە دەوترێت (ئیسلام لەسەر پێنج بنەما بنیات نراوە.....) لەڕاستیدا بریتین لەبنەماکانی باوەڕ بە پەیامی محمد(ص.)،ڕاستگۆیی و فێڵ نەکردن بریتین لەبنەماکانی ئیسلام لەکاتێکدا ڕۆژوو لەبنەماکانی باوەڕە،بەڵام لەکتێبە ئوسوڵییەکاندا بنەماکانی باوەڕ بە بنەماکانی ئیسلام ئەژمارکراوە،بەم پێیە تەنها شوێنکەوتووانی محمد(ص.) بەموسوڵمان دادەنرێن وە بنەماکانیشی خاڵین لە بەهاو ئاکار،بەڵام کاتێك ئەم ئایەتە پیرۆزە بخوێنینەوە کە دەفەرموێت﴿ان الذين امنوا والذين هادوا والنصارى والصابئين من امن بالله واليوم الاخر وعمل صالحا فلهم أجرهم عند ربهم ولاخوف عليهم ولاهم يحزنون.البقرة.62] دەبینین کە ئیسلام زۆربەی خەڵکی سەرزەوی ئەگرێتەوە،وە مەبەستیش لە (صابئين)ئەوانەن کە لەهەرسێ پەیامە ئاسمانییەکە دەرچوون،لەم مانا گشتگیرەوە دەتوانین تێبگەین لە ئایەتی (ومن



يبتغى غير الاسلام دينا فلن يقبل منه)،وە ئاينی ئیسلام ئاینێکی گونجاوە لەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتیداو حەرامکراوەکان تیایدا تەنها چواردە بابەتە کە بۆ هەمیشە ژمێردراو و داخراون،ئەمانەش هیچ دژایەتییەکیان نییە لەگەڵ یاسای هیچ وولاتێکی دونیادا،بۆ نمونە یاسای هیچ وولاتێك نییە بانگەشە بۆ ئازاری دایك و باوك یان کوشتن یان غەشکردن بکات،وە ڕێساو سزاکانیش لە ئیسلامدا بۆ گێڕانەوەی کەسانی دیکەیە لەتاوان نەك سزادانی خودی تاوانبار جگە لەسزای زینای ئاشکرا،وەسزای لەناوبردن(سێدارە) بریتییە لەئاستی باڵای کوشتنی بەئەنقەست یان ترساندنی خەڵك لەژێر هەڕەشەی چەکدا،بەڵام دەتوانرێت بەپێی یاسا سزاکەی سوك بکرێت بەشێوەیەك کەلەگەڵ کۆمەڵگەدا بگونجێت وە تێوری ﴿(حدود) واتەمەبەستی سزا دوورخستنەوەی خەڵك بێت لەتاوان﴾ کە پەیامی (محمد.ص)پێشکەشی کردووە بووە بە بنەمای یاسادانان لەهەموو وولاتانی جیهاندا وەلەهەموو بوارەکاندا.

وە سود و تایبەتمەندیی قورئانی پیرۆز بریتییە لە جێگیریی لە دەقداو جوڵەو بزووتن لە ناوەڕۆکدا،وە لەبەرئەوەی پەیامی (محمد.ص)دواین پەیامە بۆیە خوای گەورە تیایدا کامڵ بوون و کۆتایی هاتنی پەیامی ئاسمانی ڕاگەیاندووە﴿اليوم أكملت لكم دينكم وأتمت عليكم نعمتى ورضيت لكم الاسلام دينا.المائدة.3]وە بواری ئیجتهادی بۆ مرۆڤایتی بەجێ هێشتووە بەشێوەیەك کەلەگەڵ کات وشوێندا بگونجێت،وە پێغەمبەرو جێنشینە ڕاستەکانیش هەر ئەمەیان کردووە،بەڵام ئەو هەڵەیەی کە هاتووەتە ئاراوە بریتییە لە حسابکردنی ئیجتهادی پێغەمبەرو جێنشینەکان بە دین لەکاتێکدا ئەمانە تەنها بریتین لە بۆچوون و ئیجتیهادی سیاسی،وە تەنها بەچاوێکی مێژووییەوە لێیان دەڕوانرێت،وە پەیامی (محمد.ص) پەیامێکی جیهانییە و لەکاتی ئێستادا لەهەموو جیهاندا هەیەو جێبەجێ دەکرێت لە مۆناکۆوە تاکو چین جا خەڵکی بەمە بزانن یاخود نا،وەك دەفەرموێت﴿ فأقم وجهك للدين حنيفا فطرة الله التى فطرالناس عليها لاتبديل لخلق الله ذلك الدين القيم ولكن اكثر الناس لايعلمون.الروم.30] وە کاتێك ئایەتی (لااكراه فى الدين.البقرة.256] دەخوێنینەوە تێدەگەین کە دین ئامرازی زۆرلێکردنی نییە بەڵکو خۆمان بەویستی خۆمان قبوڵی دەکەین، ئەوە دەوڵەتە کەدەسەلاتی هێزو زۆرلێکردنی هەیە،وە ئەرکی دین





بریتییە لەئاراستەکردنی خەڵك بۆ بەهەشت و دوورخستنەوەیان لەدۆزەخ بەویست و ئیرادەی خۆیان وە ئازادی پەیامێکی لەپێشینەی خوداییە بۆ هەموو سەرزەوی وەك دەفەرمووێن[من شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر.کهف.29]وە ئەو ئەمانەتەی کە مرۆڤ هەڵیگرتووە بریتییە لە ئازادی مرۆڤ بۆ کردنی چاکەو خراپە،وە بەرپرسیارێتی مرۆڤ لەکردەوەکانی لەبەردەم خوادا لەگەڵ بەرپرسیارێتی لەبەرزکردنەوەی پەیامی خوادا هەموو خەڵك تیایدا ئازادن وە باوەڕدارو بێباوەڕ تیایدا یەکسانن،بۆیە پێویستە تێکەڵاویی نەکرێت لە بابەتی ئاینی و بابەتی دەسەڵات و دونیاییدا،وە پەیوەندی نێوانیان لەوەدا دەردەکەوێت کە ئاین پاشخان و مەرجەعیەتی دەوڵەت و گەل پێکەوە نیشان دەدات لەکاتێکدا دەسەڵات هەڵدەستێت بەئەرکی ژێرخان و پەیکەربەندیی دەوڵەت و ڕێکخستنی کاروباری دونیا بەشێوەیەك کە ماف و ئازادی تاکەکانی کۆمەڵگەکەی دابین بکات،بۆیە هەڵەیە لەئێستادا بمانەوێت چەمکی (دەوڵەتی ئیسلامی) بەشێوە مێژووییەکەی جێبەجێ بکەین.

وەدەربارەی دەوڵەتی پێغەمبەر(ص.)لەمەدینە دەڵێین پێغەمبەر ئەو دەوڵەتەی دامەزراند بەپەیرەوکردنی ئەو ڕێنماییانەی کە وەك (نبی) بۆی دەهات وە ئیجتهادی لەحوکمەکاندا دەکرد بەشێوەیەك کە لەگەڵ سەردەم و کۆمەڵگەکەیدا دەگونجا وە بیروڕای لەگەڵ کەسانی هاوسەردەمی خۆیدا ئاڵوگۆڕ دەکرد بەپێیتواناو زانیارییەکانیان وە کێشەو بارودۆخ و ژینگەکانیان بۆیە دروست نییە دوای زیاتر لە چواردە سەدە لەهەموو بوارو بڕیارێکدا وەکو ئەو مامەڵە بکەین،بەڵکو پێویستمان بە شۆڕشێکی تازەگەریی و نوێ خوازیی سەردەم هەیە بۆ تێگەیشن لەدەقەکان و دەرکردنی بڕیاری نوێ لەبارەیانەوە.

بەراستی ڕێزمان لە نەوەکانی ئادەم ناوە

٣

وەحی و عەقڵ و ئازادی!

خودا خۆی عەقڵی پێبەخشین،
خودا خۆی بە وەحی ئاینی بۆ ناردین،
خودا خۆی ئازادی بیرکردنەوەو هەڵبژاردنی ئاینی پێبەخشین،

خودا خۆی زۆرکردنی قەدەغەکرد و فەرمووی: بەزۆر سەپاندن لە ئایندا نییە!
ئەو عەقڵەی خودا پێیبەخشین ئەڵێت: بەرپرسیاریەتی بێ ئازادی بێمانایە!

- ✓ کەواتە ئەوەی وەحی و عەقڵ پێکەوە کۆدەکاتەوە ئازادیە.
- ✓ ئازادبە و عەقڵت کامڵ بکە.
- ✓ ئازادبە و ئاینت کامڵ بکە.

❖ ( لا إكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي ).
❖ ( وقل الحق من ربكم فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر ).

د.ئەنوەر محەمەد فەرەج DrAnwar Faraj

Design: Mhamad Majeed








## ئیشکالییەتی عەقڵی عەرەبی

زۆرینەی عەرەب لەڕووی تیۆرییەوە بڕوایان هەیە بەئایەتی ﴿كنتم خير أمه اخرجت للناس.ال عمران.110﴾ وە بڕوایان هەیە بەوەی کە ووشەی (کنتم) بۆ کاتی ڕابردوو و ئێستاو داهاتووشە،بەڵام لەڕووی کردارییەوە تەنها کورتی دەکەنەوە لەسەر ڕابردوو،وە وای دادەنێن باشترینی ئوممەت بریتین لە ئوممەتی سەدەکانی سەرەتای ئیسلام،وە ناتوانن بۆچوونێکی دروست و پشت بەستوو لەسەر بنەمای تێگەیشتن و شیکردنەوە بخەنە ڕوو،وە هەندێکیان لەوە زیاتر دەڕۆن و تەنانەت تەکفیری پێشکەوتن دەکەن،وە دەیانەوێت مرۆڤایەتی بگەڕێننەوە بۆ سەدەی حەوتەمی لەدایك بوون،وە تێپەڕبوونی کات و مێژوو فەرامۆش دەکەن وە ئەوە لەبیردەکەن کە کات ناگەڕێتەوە بۆ دواوە وە ناتوانرێت بەدیل بۆ ئەوسونەتی خودا بدۆزرێتەوە کە تێپەڕینی کات و گۆڕانی بارودۆخە،تەنها کەسانی ناهۆشیار وایدەبینن کە مێژوو وە ڕەوڕەوەی مێژوو نرخی نییە،چونکە هەموو بونەوەرێك ملکەچە بۆ سێ بنەمای (بوون،ڕۆشتن،گۆڕان–کینونە،سیرورە،صیرورە)چونکە بوون بەبێ گەشەکردن نییە وە بەپێچەوانەشەوە،وەك دەفەرموێت﴿قل سيروا فى الارچ پم انڤروا كيف كان عاقبه المكڒبين.الانعام.11﴾،کۆمەڵگەی بێدەنگ و نەگۆڕ تەنها لەبەهەشتدا هەیە بەڵام کۆمەڵگەی دونیایی پێویستە سێ بنەمای هەبێت کەلەسەرەوە ناوبران،هەرکەسێك یەکێك لەو بنەمایانە فەرامۆش بکات ئەوا لەژێر تیشکی خۆردا جێگەی نابێتەوە،وەك ئەوەی نمونەی قورئانی پیرۆزمان بۆ بێنێتەوە لەنمونەی چیرۆکی پیاوانی ئەشکەوت بۆ فەرامۆشکردنی میژوو(سیرورە) ئەمەش کاتێك



گەنجە بڕوادارەکانی بانگی گەلەکەیان کرد بۆ ڕێگەی ڕاست بەلاَم ناچارکران بە کۆچکردن بۆ ئەشکەوت وە بۆ (300) ساڵ خەوتن،واتە کات دەربارەی ئەوان ڕاوەستا لەکاتێکدا بۆ خەڵکی تێدەپەڕی وە کاتێك بەئاگاهاتنەوە بینیان ئەوەی کە لێی هەڵهاتن ئێستا لەناوخەڵکیدا بلاَوە بەلاَم نەیانتوانی لەگەڵ بارودۆخی تازە خۆیان بگونجێنن و مردن.

وە ئێستا کۆمەڵگەی عەرەبی بەکردەوە هەر لە(بوون–کینونە)دا دەژی وە کات(سیرورە) بەسەریاندا تێپەڕیوە بەلاَم بنەمای سێیەم (صیرورە)یان نییە،بۆیە هێزی خۆیان لەخاڵی بەهێزی شارستانییەتەکانی دیکەوە وەردەگرن وە عەقڵی گشتی عەرەبی توانای بەرهەمهێنانی مەعریفەی نییە،لەڕووی دۆزینەوەی زانستییەوە بەکاربەرە،بۆیە نابێت بەهۆی زۆری دەرچووی زانکۆکانەوە لەخۆبایی ببین، چونکە لەزانکۆکانماندا زانست تەڵقین دەکرێت و هانی لەبەرکردن دەدرێت نەك دۆزینەوە،وە لەڕووی تەکنەلۆژیاوە(صیرورە) لەخاڵی سفردایە بەلاَم زانستەمرۆڤایەتییەکان بوون بە دەردو بەلا بەهۆی ئەو هەموو ئاراستەو بۆچوونانەی لێی بووەتەوە کەئەمەش بووەتە هۆی دابەش بوون و جیاوازیی کۆمەڵگەی عەرەبی،بۆنمونە ئیسلامییەکان کارلەسەر بنەمای (پاریزگاریی کردن لەکلتور) دەکەن وە دروشمی (هەرکەس کار بەلۆژیك بکات لەدین دەردەچێت) یان بەرزکردووەتەوە،و وەك دوژمن سەیری فەلسەفە دەکەن لەکاتێکدا فەلسەفەی ئیسلامیی لەچاخی زێڕینی شارستانییەتی ئیسلامییدا گەشەی کرد،بەلاَم دواتر لەناوبرا،وە فیقهی ئیسلامی لەسەدەکانی سەرەتادا چەسپێنرا بەدوور لە لەگۆڕانکاریی و پێشکەوتنەکانی ژیان،وە ڕۆشنبیریی ئیسلامی بەزۆریی جەخت دەکاتەوە لەچەند دروشمێك و ە شتی دیکە بۆ ئەم دروشمانە زیاد دەکات بۆ نمونە بالاَپۆشیی،وە بەشێوەیەك باسی چەمکی فەرمانڕەوایەتی خودا ئەکەن کە بژاردەی مرۆڤ ڕەت دەکەنەوەو وایدادەنێن کە هەموو مەبەستێك تەنها دوارۆژە وە لەبیری دەکەن کە دونیا کێڵگەی دوارۆژە وە ئەو ئەمانەتەی کە مرۆڤ هەڵیگرتووە ئازادبوونیەتی لە گوێڕایەڵی کردنی خودا یانی گوێڕایەڵی نەکردنی وەك دەفەرموویت﴿وما خلقت الجن والانس الا ليعبدون.الذاريات.66﴾،هەروەها لیبراڵەکانی عەرەب بەتەواویی کلتورو مێژووی ئوممەت ڕەتدەکەنەوە وە تەواوی ئەو شتانەی کە کلتوری ڕۆژئاوا بەرهەمی هێناوە بەدروستی دەزانن،وە



مارکسییەکانیش تیۆری مارکس لەمێژوودا وەردەگرن و هەوڵی جێبەجێکردنی دەدەن بەسەرکلتوری عەرەبیدا لەکاتی ئێستادا وە یەکەم شت کە تەبەنی دەکەن بریتییە لە بێباوەڕیی،هەرچی نەتەوەییەکانیشە کاریگەرن بەچەندین کلتوری جیاواز وە هیچ مۆدێلێکی ڕوونیان پێشکەش نەکردووە بۆ ڕێساکان و پەیوەندییە مرۆییەکان.

ئەگەر بڕوانین لە هۆکارەکانی نەبوونی عەقڵیەتی بەرهەمهێنی عەرەبی دەبینین کەهۆکارەکەی ئەوەیە عەقڵی تاکەکانی بەگشتی عەقڵێکی هاوشێوەو لێکچووە وە توانای بیرکردنەوەو داهێنانی نییە،لەمەشدا باوەڕدارو بێباوەڕ یەکسانن،باوەڕدار پێویستی بەنمونەی سەدەی حەوتەمە تاکو قیاسی لەسەربکات بۆ کاتی ئێستا،وە بێباوەڕیش بۆ هەمان مەبەست پێویستی بەنمونەی مارکسییەکانی پێشوو هەیە.

هەرلەوکاتەوەی شەڕی نێوان فەیلەسوفەکان و فەقیهەکان لەسودی فەقیهەکان کۆتایی هات ئیتر کەوتینە ژێر کاریگەریی چەندین بۆچوون و عەقڵیەتی نادروست و نەگونجاو و دواکەوتووانەوە،بۆنمونە دەوترێت ئازادی ڕادەربڕین دەرگای بەرەڵایی دەکاتەوە،یان ئافرەت فیتنەیە بۆ پیاو،یان ئەوەی کە موبایل دەبینین دەڵێین ئایا حەڵاڵە یان حەرامە نەك لەبەرهەمهێنانی بکۆڵینەوە،وە من بەرپرسیارێتی تیۆریزەکردن و مانەوەی ئەم جۆرە عەقڵیەتە ئەخەمە ئەستۆی نوخبەی پێشەواو زانایانی ئوممەتی ئیسلامی، لەکاتێکدا پێغەمبەر محمد(ص) کە سەرکردایەتی شەڕەکانی بەدرو ئوحود و خەندەقی کرد لەپێناوی حەق و باتڵ بوو نەك حەرام و حەڵاڵ،چونکە عەرەب لەسەردەمی نەفامیشدا چەندین بەهای ئەخلاقی باڵایان هەبوو وە ئیسلام هات ئەوانەی جێگیرکرد تەنها وەهم و پوچەڵەکانی لابردن وەك پێغەمبەر(ص.)دەفەرموویت﴿انما بعیت لاتمم مکارم الخلاق).بەتێڕوانین لەم ئیشکالیەتەی عەقڵی عەرەبیی وباسکردنی ئەو هۆکارانە لەدۆخ و حاڵەتی عەقڵی عەرەبی تێدەگەین وە هۆکارەکانی دواکەوتوویی و بەکاربەریی کۆمەڵگەی عەرەبی وپێویستی سەرهەڵدانی شورشی تازەگەریی بۆ نوێکردنەوەی ئەو عەقڵییەتەمان بۆ دەردەکەوێت.



# توانەوەی بەستەلەکی جیاوازیەکان

ئارام قادر



لەرابردوودا كۆمەلیك پاساوی سیاسی ورۆشنبیری وفیكری هەبوو بۆدروست بونی چەند گروپ ولایەنیكی ئیسلامی لە كوردستان كەهەر یەكیكیان بەجۆریك وبەمیكانیزمیكی دیاری كراو كاریان كردوە وخۆیان پەیوەست كردووە بەقوتابخانەیەكی فكریەوە بەلام ئەمرۆ لە سایەی پیشكەوتنە سیاسی ورۆشنبیری و تەكنەلۆجی و فكریەكان كە لەئاست جیهان ولە رەوتی كاری ئیسلامیدا دروست بووە وەهەروەها لە ئەنجامی گۆرانكاریە سیاسی وبارودۆخەناوخۆیەكانی ناوعیراق وكوردستان جیاوازیەكانی زۆر كەم كردوەتەوە وئەو دیوارە ئەستورانەی كە هەبوون لەنیوان رەوتە ئیسلامیەكانی كوردستاندا ووردە ووردە بەرەو توانەوە دەرۆن و هەموولایەك هەست بەوەدەكات كە پانتایی جیاوازیەكان زۆر بەرتەسك بونەتەوە و رابوبۆچونەكان گەر لەیەكەوە نزیك نەبن زۆر دوریش نین لە یەكتری، هەرسی لایەنی ئیسلامی یەكگرتوی ئیسلامی وكۆمەلی ئیسلامی وبزوتنەوەی ئیسلامی وكەسایەتیە سەربەخۆو ریكخراوەكانی كۆمەلگای مەدەنی بەرەو یەك ئاراستە كاردەكەن لەگۆرەپانی كوردستان كە ئەویش ئەنجامدانی ململانی سیاسیە لە پیناو چاكسازی ئیداری وسیاسی لە هەریمی كوردستان ، لەریگای هەولدان بۆ خزمەت كردنی خەلك ونەهیشتنی گەندەلی و بەرقەراكردنی دادگەری لەكۆمەلگای



کوردیدا، وەگەر ووردبونەوەیەك بە بەرنامەی سیاسی ورۆشنبیری لایەنە ئیسلامیەکاندا بکەین هەست دەکەین ئەو جیاوازیانە بونەتە هێلێکی تەنك، وەبەتایبەت گەر سەیری بەرنامەی هەلبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوینەرانی عیراق وپەرلەمانی کوردستان بکەین دروستی بۆچونەکانمان دەردەکەویت،وە زەرورەتی بەرتەسك کردنەوەی جیاوازیەکان وتوانەوەی ئەو بەستەلکە بۆ قۆناغی ئیستای کوردستان زەرورەتیکی ئاینی ونیشتمانی وسیاسیە کە کوردستان بەقۆناغیکی مەتر سیداردا تیدەپەریت وبارودۆخیکی نوی هاتوتە پیشەوە کە ئیسلامیەکانی کوردستان پیوستە چاو خشاندنەوەیەکی جدیی بکەن بە ئیستراتیجیەتی کار سیاسیان لەکوردستان، تابتوانن بون وقەوارەی خۆیان بسەلمینن ورۆلی سروشتی خۆیان لەکوردستان پەیرەو بکەن، ئەو پرۆەژی کە بۆ ئەمرۆی کوردستان گونجاو بیت و هەمو حزب ولایەنیکیش هەست بەبون وقەوارەی خۆی بکات ومونافەسەیەکی تەندروستیش دروست ببیت لەنیوان لایەنە ئیسلامیەکاندا بریتیە لەبونی پرۆژەی هاوبەش و دروست کردنی زەمینە بۆکاری هاوبەش بینە مەیدان بە پرۆژەیەکی نوی و وەك هیزێکی تازە کە لەوکاتەشدا دەتوانن بن بە ژمارەیەکی بەهیزی ناو گۆرەپانی سیاسی کە دەرئەنجامەکەی دەبیتە سەرکەوتنی پرۆسەی سیاسی ئیسلامی وهەموو لایەنەکانیکش قەوارە وبونی خۆیان گەورەترە دەبیت لەوەی ئیستا هەیانە ، چونکە ئەم بارودخە بارودۆخیکی نویە ودەبیت میکانیزمیکی نوی بهینرێتە کایە بەتایبەت ئازادی تاکەکان وبونی قەوارەکان ورا جیاوازەکان کۆبکاتەوە و بەیەك ئاراستە کاربکریت چونکە ئیستا سەردەمی کۆپی کردنی فیکر وهزری یەکتر ئەستمەولەقالب دانی تاکەکان ناگونجیت لەگەل سەدەی بیست ویەکدا و مافیکی سروشتی هەموو قەوارەکانیشە داوای بەرجەستەکردنی میژوو خەباتی خۆشیان بکەن، بەلگە نەویستیشە ئەم هەنگاوەش سودی گەورەی میللەتی تیدا بەرجەستە دەبیت و سەرەتایەکە بۆ ئاسۆیەکی نوی( ولینصرن الله من ینصره ان الله لقوی عزیز)

## نەفرەت لێکراوە لە ئاینی خوادا !

ملعون في دين الرحمن...
من يسجن شعباً... من يخنق فكراً..
من يرفع سوطاً.. من يُسكت رأياً..
من يبني سجناً.. من يرفع رايات الطغيان..
ملعون في كل الأديان.. من يُهدر حق الإنسان..
حتى لو صلّى أو زكّى وعاش العُمرَ مع القرآن.
جمال الدين الأفغاني

(جەمالەدینی ئەفغانی)
ئەفەرموێت:

نەفرەت لێکراوە لە ئاینی خوادا ؛
ئەوەی گەلێک بەند دەکات!
ئەوەی بیرێک ئەخنکێنێت!
ئەوەی قامچیەک بەرز دەکاتەوە!
ئەوەی رایەک بێدەنگ دەکات!
ئەوەی بەندیخانەیەک دروست دەکات!
ئەوەی ئاڵای ستەمکاری بڵند دەکات!

نەفرەت لێکراوە لە هەموو ئایینەکاندا ؛
ئەوەی مافی ئینسانێک پێشێل دەکات!
ئەگەر نوێژخوێنیش بێت، یان زەکاتیش بدات یان تەواوی تەمەنی لەگەڵ قورئاندا ژیابێت!

د. ئەنوەر محەمەد فەرەج





# نوێکردنەوەی گوتاری ئیسلامی



د.ئاراس محمد صالح

گوتاری ئیسلامی سەرجەم ئەو گوتار و نووسین و بڵاوكرانەوە دەگرێتەوە كە هەوڵی ڕونكردنەوەی بنەماو مەبەستەكانی ئاین دەدات و تەفسیری دەقەكانی دەكات، كەواتە گوتاری ئیسلامی لە گوتاری مامۆستایەكی ئاینییەوە هەتا دەگاتە گوتارێكی ڕۆژنامەوانی لەخۆ دەگرێت.

نوێكردنەوەی گوتاری ئیسلامی مەبەست پاككردنەوەی ئەو گوتارەیە لە شتی ناڕاست و هەڵەو خورافەو تەفسیری تاكڕەوانەی توند و تەئویلی نادروست بۆ مەبەستی كاتی و ناڕەوا، لە هەمان كاتدا بەرزكردنەوەی ئاستی ئەو گوتارە لەڕووی شێوەو ناوەڕۆكەوە بەجۆرێكی وەها لە ئاستی سەردەم و پێویستی ڕۆحی و فكری و ڕۆشنبیری تاكی موسڵماندا بێت، هەروەها بتوانێت پەیام و مەبەست و ئامانجی ئیسلام بگەیەنێتە بەرامبەر، چونكە مەرج نیە هەموو كات گوتاری ئیسلامی بۆ تاكی موسڵمان بێت.

كێشەكانی گوتاری ئیسلامی

یەكەم/ لاوازی لەڕووی ناوەرۆكەوە/ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا گوتاری ئیسلامی لە ئاستێكی لاوازی وەهادایە خەڵكە نەخوێندەوارو شەقامی گشتیش سكاڵای لەدەست دەكات، گوتارێكە هیچ پێشینەیەكی مەعریفی و ماندووبونی پێوە دیارنیە، گوتاربێژەكان بەردەوام خۆیان دووبارە دەكەنەوە، پشت بەخوێندنەوەو قوڵبوونەوەی زانستی نابەستن و زیاتر كار لەسەر بیرو ئەوەی لەبیریاندا ماوەو لەسەر شەقام بیستوویانە دەیڵێنەوە، بەتایبەت لەكانی بۆنەكاندا، وەك هاتنی مانگی ڕەمەزان و مانگی مەولود، ئەوەی لەبارەی ڕەمەزانەوە دەیڵێن هەمان ئەو قسانەی



هەشتاکانی سەدەی ڕابردووە چەندبارەی دەکەنەوە، لەبارەی لەدایك بوونی پێغەمبەریشەوە درودی خوای لێبێت بەهەمان شێوە، کە دەیان ڕیوایەتی لاوازو مەزوعی تێدایەو گوتاربێژێك تۆزێك خۆی ماندوو ناکات و لێکۆڵینەوەی لە سەند و مەتنی ئەو ڕیوایەتانە بکات و ڕاست و لاواز لە یەکتر جیابکاتەوە، بەردەوام ئەو گێڕانەوە لاوازو خورافیانە بەناوی دینەوە دەکرێتە مێشکی خەڵکی موسڵمانەوە.

دووەم/ قەتیسبوونی لە خەیاڵ و ڕابردوودا/ گوتاری ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی لە ڕابردوویەکی زۆر دووردا دەخولێتەوە، بۆ نمونە هەرکات باسی ماڵ بەخشین و خۆنەویستی و سوربوون لەسەر زانست و خەمخۆری دین دەکرێت، نمونە بە هاوەڵان و زانایانی پێشوو دەهێننەوەو زیادەڕەویەکی زۆر تێدا دەکەن، هەندێکجار وەك ئەفسانەو خەیاڵ وایە، ئیتر ناشزانن ئەوشتانەی باسی دەکەن ڕاستن یان هیچ بنەمایەکی زانستیان نیە، چونکە لەکاتی قسەکردنیان ناڵێن لە کتێبی مێژووی تەبەری یان ئیبنوکەسیر و یان لە فلاّن کتێبی ژیانی پێغەمبەردا درودی خوای لێبێت فلاّن زانا وەهای گوتووە، لەکاتی ئێستا دەیان قوتابی و مامۆستای دەرچووی بەشەکانی مێژوو زانستە ئیسلامیەکان و بەشەکانی تر هەیەو بە ئاسانی بێبنەمایی نمونەکانی گوتاربێژ دەزانن، ئەو سەردەمە گوزەشت کە واعیزی دینی خەڵکی بە ڕەشۆکی و عەوام بزانن، زۆرجار لەکاتی گوتارداندا عەوامی واعیز دەردەکەوێت نەك بە پێچەوانەوە، لە هەمان کاتدا پێویستە دین لەو مێژووە دوورە ڕزگار بکرێت و ئەمڕۆ دین چی دەکات و چی پێدەکرێت و چەندێك توانای چارەسەری کیشەکانی تاك و کۆمەڵی هەیە؟.

سێیەم/ عاتیفەو سۆز و وروژاندن/ گوتاربێژەکان زۆر زیرەکانە بۆ زۆرکردنی جەماوەری خۆیان کارلەسەر وروژاندنی سۆزی خەڵکی دەکەن و زۆر کەمتر بیر لە گوتاری لۆژیکی و پێویستی خەڵك دەکەنەوە، بۆ نمونە بە حەماسێکی زۆرەوە چەند وتارێك دەدەن بەناونیشانی (ئەی پێغەمبەری خوا کێشەم هەیە) یان شتی لەو بابەتە، زۆر سەرکەوتوانە سۆزی گوێگر دەوروژێنن و بەرەو خۆیان ڕایان دەکێشن و وەك واعیزێکی سەرکەوتوو باسیان دەکەن، بەڵام ئەگەر بڵێین (چارەسەری کێشەکانی خەڵك بەپێی سونەتی پێغەمبەر) زۆر زەحمەتە سۆزی گوێگر بوروژێنن، لەگەڵ ئەوەشدا



ئەگەر بەشێوەی دووەم بێت زۆر زانستی ترو لۆژیکی ترەو ئەگەر گوتاربێژ توانای زانستی هەبێت دەتوانێت ڕوویەکی جوانتری ئیسلام پیشان بدات و کێشەی خەڵکیش چارەسەر بکات.

چوارەم/ نائامادەگی ئەقڵانیەت/ زۆر گەڕانەوە بۆ مێژوو پەنابردن بۆ چیرۆکی ناعەقڵانی و خوراف، وروژاندنی سۆز، هەموو ئەمانە ئامادەییان لە گوتاری ئیسلامیدا هەیە، هەموو ئەمانەیش بەڵگەی ونبوونی عەقڵن لەناو گوتاری ئیسلامییدا، گوتاربێژەکان کاتێك باسی دونیانەویستی دەکەن باس لە وەسیەتە خورافیەکەی ئەسکەندەر دەکەن، کاتێك وەسیەتی کردووە ئەگەر مرد لە کفنەکەیەوە هەردوو دەستی بەکراوەیی دەربهێنن، هەتا خەڵکی بزانن کەس لەگەڵ خۆی هیچ نابانە گۆڕەوە، ئەسکەندەر کێیەو لەچ کات و سەردەم و وڵاتێکدا ژیاوە؟ ئەو وەسیتە چۆن گواستراوەتەوەو سەنەدەکەی چۆنە؟ هەموو ئەمانە وەهمن و هیچ واعیزێك ناتوانێ وەڵامی بداتەوە؟ ئەی چۆن وەسیتەکەی دەکەنە بەڵگەی دونیا نەویستی هەر نازانن؟!، ئیسلام دینی دونیاو قیامەتە، دونیا ئاوەدان دەکاتەوەو پاداشتی لەسەر وەردەگرێت و قیامەتێکی باشتری بۆخۆی پێدەباتەوە، ئایەتەکانی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر درودی خوای لێبێت بەڵگەی ئەم قسەیەن و، چیرۆکەکەی ئەسکەندەر جۆرێکە لە گەوجاندنی خەڵکی.

پێنجەم/ لاوازی مەعریفی/ زۆرجار گوتاری گوتاربێژو وەعزی واعیزەکان لە ئامۆژگاری باوکێکی نەخوێندەوار دەکات بۆ کوڕەکەی ئەوەندە لاوازە و سادەیە، ئەمەیش بەڵگەی دەستکورتی مەعریفی و نەخوێندنەوەی بەردەوامە، بێگومان گوتارێکی هەفتانەی نیوسەعاتی پێویستی بە نزیکەی شەش بۆ حەوت سەعات خوێندنەوە هەیە، بەڵام ئایا گوتاربێژەکانی سەرمینبەرەکان ئەگەر ڕاستگۆیانە وەڵام بدەنەوە هەفتانە چەند سەعات دەخوێننەوە، چەندە ئاگاداری نوسین و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی و نوێن؟، ئەگەر ڕاستیش وەڵام نەدەنەوە هەموو خوێنەرێك کاتێك گوێ لە بەرامبەری دەگرێت دەزانێت خوێنەرە یان نا؟.

شەشەم/ حەماس و تەشەنوج/ زۆربەی کات کە گوێ لە گوتاری سەر مینبەرەکان دەبێت جۆرێك لە حەماس و توڕەبوون و تەشەنوجێکی زۆری پێوە دیارە، توڕەبوونەکە زۆربەی کات بۆ شاردنەوەی لاوازی گوتار و گوتارخوێنە، گوتارخوێن لەڕووی دەروونیەوە هەست دەکات گوتارەکەی لاوازە و



توانای زانستی نیە، هەربۆیە پەنا بۆ دەنگ هەڵبڕین و توڕەبوون دەبات، بۆ ئەوەی لاوازی خۆی وگوتارەکەی بشارێتەوە، لەهەمان کاتدا جۆرێك لە خۆگەورەکردن هەڵخەڵەتاندنی گوێگر، بۆ ئەوەی بڵێن فلاَن واعیز زۆر خەمخۆری ئیسلامەو گڕی گرتووە، زۆرجار گوتارخوێن باسی دەستنوێژ یان بابەتێکی لەو جۆرە دەکات، کە هیچ پێویست بە دەنگ هەڵبڕین و توڕەبوون ناکات، دەکرێت بە زمانێکی هێمن و زانستی بۆ گوێگر ڕوون بکرێتەوەو پێویست بۆ خۆسەخڵەت کردن ناکات.

تەشەنوج زۆربەی کات واعیزو گوتارخوێنی دینی لەهەوڵی داتاشینی دوژمنی وەهمی بیردۆزەی پلانگێڕیە (نظریە تأمریە) وێنای دوژمنی گەورە دەکات و زۆرجار دەڵێت من وەك نوێنەری ئیسلام دوژمنم زۆرەو زۆرجار دەڵێت دین لە مەترسیدایە و دوژمنەکانی دین خەریکن دینەکەمان لەڕیشە دەردێنن، هەموو ئەم جۆرە وتانە قسەی کەسانی بیٚ مەعریفە و دەستکورتی ڕۆشنبیریین.

نوێکردنەوەی گوتاری ئیسلامی

بۆ ئەوەی گوتاری ئیسلامی نوێبکرێتەوە لە ڕووی ناوەڕۆك و شێوازەوە لە ئاستی سەردەمەکەو پێویستی ڕۆحی و فکری خەڵکدا بێت بەگشتی پێویستە چەند هەنگاوی سەرەکی و گرنگ بنرێت بۆ ئەو مەبەستە گرنگە وەك:

یەکەم/ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی/ گوتاربێژ ئەگەر شتێکی نەبێت ناتوانێت بیبەخشێت، ئەگەر توانای زانستی و مەعریفی و ڕۆشنبیری لاوازبێت چۆن دەتوانێت گوتار بەو ناوەڕۆکانەوە بدات؟ بۆیە پێویستە بەلانی کەم هەر گوتاربێژێکی سەرمینبەرەکان ئەگەر دەرچووی زانکۆ نەبێت گوتاری نەدرێتیٚ بەلانی کەمەوە، سەرپەرشتی و بەدواچوون هەبێت و ئەگەر گوتاربێژێك توانای گوتاری نەبوو زۆر ئاسایە گوتاری لێوەربگیرێتەوە بکرێتە پێشنوێژ و دەیان گەنجی بەتوانای دەرچووی زانکۆ هەیە لە شوێنی دابنرێت.

هەروەها لە ڕێگای خولی زانستی و ڕۆشنبیریەوە بەردەوام هەوڵی باشترکردنی توانای گوتاربێژان بدرێت، لە ڕووی ئامادەکردنی گوتار و بەرنامەکانی کۆمپیوتەر و تۆڕەکانی ئەنتەرنێت شارەزا بکرێن، کە هەموو ئەمانە کارئاسانی باش دەکەن بۆ ئامادەکردنی گوتار و دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستی فەرمودە و قسەی زاناکان و دەستەبەرکردنی سەرچاوەی باش زانستی بۆ گوتاربێژ.





دووەم/ بکرێتە گوتاری ئەمڕۆ/ پێویستە گوتاربێژان خۆیان لە ڕابردووی دوور ڕزگار بکەن و گوتار بۆ ئەمڕۆ بدەن، دەیان نمونەی مێژوو دەهێننەوە کە نازانرێت ڕاستن یان دروستکراو، وەك ئەوەی عومەری کوڕی خەتاب بەکۆڵ ئاردی بردووە بۆ خەڵکی هەژار و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هەر نان و پیازی خواردووە، فلان زانا بەردەوام خەریکی زانست بووەو بەدوای فەرمودەیەکەدا لە مەدینەوە چووە بۆ کوفە و چەندانی تر، ئەی باشە واعیز و گوتاربێژەکان بۆ ئەمڕۆ خۆیان هیلاك ناکەن و دەیان فەرمودەی لاواز و دروستکراو و چیرۆکی خورافی دەدەن بەگوێی موسڵماناندا، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا هەموو کتێبەکانی فەرمودە تەحقیق و تەخریج کراون لەڕێگەی تۆڕەکانی ئەنتەرنێتەوە بە ئاسانی دەست دەکەون و پێویست ناکات بەپێی لە مەکەوە بچن بۆ کوفە و بەغداد؟.!

سێیەم/ دوورکەوتنەوە لە خەیاڵ و زیادەڕەوی/ زۆر جەختکردنەوەو زیادەڕەوی و گەورەکردنی شتەکان یەکێکە لەسیما لاوازەکانی گوتاری دینی، وەك ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر لەبەر خاتری یەکتر ئاویان نەخواردوەتەوەو ژنیان بۆ یەکتر تەڵاق داوەو زانایانی پێشوو نەخەوتوون و خواردنیان نەخواردووە و چەندان موبالەغەی بێبنەمای تر، ئەوەندە زیادەڕەوی دەکەن دینداری دەکەن خەیاڵ و وەهم و لە توانای کەسدا نییە ئاینداری بکات.

ئیسلام ئاینێکی واقیعیەو خوای گەورە دایبەزاندووە بۆ مرۆڤ، مرۆڤی ساغ و نەخۆش و لاواز و کەمئەندام و هەرکەس بەپێی توانای خۆی دەتوانێت دینداری بکات، خوا لەوە زیاتری لێ داواناکات، لە هیچ دەقێکی ئاینیدا نەهاتووە خۆت برسی بکەی و نەخەویت و تەرکی دونیا بکەی، هەموو ئەو جۆرە شتانە دروستکراو و پێچەوانەی بنەماکانی ئاین و سونەتی پێغەمبەرن درودی خوای لێبێت.چوارەم/ ئامادەگی و عەقڵ و دوورکەوتنەوە لە ورووژاندن/ پێویستە گوتاربێژان زیاتر کارلەسەر ئەقڵانیەت و پێویستی خەڵك و گەیاندنی ڕووی جوانی ئیسلام بدات و وەك خۆی ڕونی بکەنەوەو دوور بکەنەوە لە جوڵاندندنی سۆزو وروژاندن و خۆنواندنی ناشیرین.

پێنجەم/ قوڵبوونەوەی مەعریفی/ سادەیی و ڕووکەشی و لاوازی گوتاری ئاینی هەموو کەس هەستی پێدەکات و جێگەی گومان نیە، پێویستە گوتاربێژان بەردەوام بخوێنەوەو ئاستی خۆیان



بەرزبکەنەوە خۆیان لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیاندا بکەن، بۆچی قەرەباڵغی دەوری گوتاربێژەکان ڕەشەخەڵکەکەن و ڕۆشنبیر و دەستەبژێر لەوانەوە دوورن، بۆچی لەناوەندە ڕۆشنبیری و مەعریفی و توێژینەوەی زانستیدا ئەوان ئامادەییان نیە، بۆ لەناوەندەکانی بڕیارەوە دوورن، بۆچی عەلادین سەجادی و شێخ محەمەدی خاڵ و مەلا عەبدولکەریمی موردەریس دروست نابنەوە، هەموو ئەمانە جێگەی لەسەر وەستان و بەدواداچوونی خودی گوتاربێژەکانە.

شەشەم/ گوێگرتن بۆ ڕەخنە/ نەبوونی ڕەخنە لەناوندە ئاینیەکەو گوتاری ئاینی لە ترسی داخراوی ئەو ناوەندەیە، واعیزی دینی زۆر زەحمەتە ڕەخنە قبوڵ بکات، ڕەخنە گرتن لەلای ئەوان واتە ڕەخنەگرتن لە دین ڕەخنەگرتن لە دین واتە ڕەخنە گرتن لەخوا ڕەخنەگرتنیش لە خوا کوفرە، ئەم بیرکردنەوە زۆر هەڵەو نا ئەقلآنیە، واعیزی دینی نوێنەری خوا نیە، لاوازی ئەویش لاوازی ئاین نیە، پێویستە هەموو کات ڕەخنە هەبێت، ڕەخنە ئاوێنەیەکە مرۆڤ هەڵەکانی خۆی تێدا دەبێنیت و هەوڵی ڕاستکردنەوەو باشتر کردنی دەدات، نەبوونی ڕەخنە وا لەمرۆڤ دەکات بەردەوام لە یەك بازنەدا خۆی دووبارە بکاتەوە و گۆڕان و گەشەکردن بەخۆیەوە نابینێ.

حەوتەم/ ئامادەکردنی گوتاربێژ/ لە ڕێگەی خول و پەیمانگای پێگەیاندنی گوتاربێژ، بە وەرگرتنی وانەی زانستی و ڕۆشنبیری، چۆنیەتی ئامادەکردنی گوتار و هونەرەکانی وتاردان، دەکرێت لەم ڕێگەیەوە گوتاربێژی سەرکەوتوو ئامادەبکرێت، زۆر گوتاربێژ لەڕوی زمان و جەستەوە مەرجەکانی گوتاربێژی تێدایە، بەلآم لە ڕووی زانستی و هونەری گوتاردانەوە زۆر لاوازە ناتوانێت پەیامەکەی بگەیەنێت، ئەو کەسانە دەکرێت لەڕێگەی ئەو خولانەوە پێشبخرێن و بکرێنە گوتاربێژی سەرکەوتوو.

گەشەپێدانی گوتار لەڕووی شێوەوە

لەڕووی شێوەوە پێویستە هەوڵی باشترکردن و بەهێزکردنی گوتاری ئاینی بدرێت وەك:

یەك بابەتی(وحدە موچوع)/ پێویستە گوتاربێژ پێشتر گوتارەکەی ئامادە بکات و یەك بابەتی تێدا بێت، ناکرێت لە یەك گوتاردا کۆمەڵە شتێکی پرش و بلآو بلێت و خۆشی نەزانێت باسی چیکردووە.



بەرز و نزمی دەنگ/ لە ڕووی دەنگ هەڵبڕین و بەرزی و نزمی دەنگ زۆر گرنگە بۆ گوتاربێژ و واعیزو دەرسبێژی قوتابخانەو زانکۆ، بەیەك ڕیتم قسەکردن گوێگر ماندو دەکات و تاقەتی گوێگرتنی نیە، بۆیە هونەری دەنگ زۆر گرنگە بۆ گوتاربێژ، دەبێت بزانێت کەی دەنگ بەرزدەکاتەوەو کەی نزمی دەکاتەوە، دەبێت زۆر هونەرکارانە یاری بەدەنگ بکات.

ڕێکپۆشی/ جل و بەرگ و ڕێکپۆشی زۆر گرنگە بۆ گوتاربێژ، نابێت بەناوی تەوازوع و خاکی بوون و سادەیی جلی شڕو چرۆلۆچاوی لەبەر بکات، یان بە پێچەوانەوە زۆرجار گوتاربێژی ئاینی مێزەری سپی و کەشیی دەکاتە ملی بۆ ئەوەی بڵێن مامۆستا زۆر نورانیەو جلی پیرۆزی لەبەر کردووە.

جوان وەستان و ئاماژەکردن/ جوان وەستان و شپرزە نەبوون و دامەزراوی زۆر پێویستە بۆ گوتاربێژ.

هاوسەنگی جوڵە/ جوڵە و ئاماژە کردن بەدەست و پەنجەکان بەپێی پێویست و پاراستی هاوسەنگی پێویستە بۆ گوتاربێژو واعیزو دەرسبێژەکان.

گوتارەکە پێویستی خەڵك بێت/ گوتاربێژ دەبێت سەرکەوتوو بێت لە هەڵبژاردنی بابەتی گوتارەکەیدا و نابێت بابەتی مردوو یان کات بەسەرچوو پێشکەش بکات، بۆ نمونە لەسەر مینبەر باسی شەڕی نێوان عەلی کوڕی ئەبوتالیب و موعاویە بکات.

هیوابەخش بێت/ زۆرێك لە گوتارەکانی ڕوخێنەر و بێهیواکەرن، بۆ نمونە دەڵێن پیاوی چاك نەماوە ماڵی حەڵاڵ نەماوە، خەڵکی هەمووی لەخوا بێ ئاگایە، هەموو ئەم شتانە گوتاری ئاینی سیخناخ کردووە، ئەی ئەگەر وەزعە وایە ئیتر بۆ مامۆستا گوتار دەدات و خۆی ماندوو دەکات.

گرنگیدان بە بابەتەکانی سەردەم/ پێکەوە ژیان/ ژینگە/ کێشەی لاوان و بێکاری/ زۆر گرنگن بۆ گوێگری گوتاربێژەکان و هۆشیارکردنەوەی موسڵمانان لەو بابەتە زیندوانەی سەردەم.

لاوازی زمان و زمانی بازاڕی/ گوتاربێژ هەوڵبدات زیاتر بە زمانێکی ئەدەبی بدوێت و زۆر دانەبەزێت بۆ ئاستی بازاڕی لە ڕووی زمان و ناوەڕۆکەوە

دیـــــــداری  لــەگــەڵ

# تەحسین حەمە غریب:

## # مەرج نییە ئاین لەهەمووسەردەمەکاندا، هەمووڕۆڵەکان ببینێت.

**# مەبەستم لە ئیسلامی کوردیی ئەوەیە، کاتێک ئایینی ئیسلام دێتە ناو کوردەوە، دەبێت مامەڵە لەگەڵ ئەو دیوە قوڵەی نەتەوەیدابکات، نەک ئیسلامێکی تازە دابهێنین.**

**#ئیسلام بەرگێکی عەرەبییانەی هەیە، کەبەشێک نییە لە ئیسلام، ئەو بەرگەش لەناو ئێمەی کوردا بوونی هەیە**

**گفتوگۆی : محمد دلێر**

مەسەلەی نوێبوونەوە لە دین و بابەتەکانی تریشدا بەردەوامە و لە وێستگە و سەردەمە جیاوازەکاندا دێتەوە بەرباس لە فۆڕم و ناوەڕۆکی نوێدا.ئەمەش بۆ هەرشتێك پێویستە کە بیەوێت بەزیندوویی و بەژیانەوە لە مەیدانە جیاوازەکاندا بمێنێتەوە. ئێمەش لەم کاتەدا و دەربارەی ئەم باسە لەگەڵ شارەزا و تایبەتمەند لەفکرو عیرفانی ئیسلامیدا ( م. تحسين حمەغريب) ، دەربارەی ئە م تەوەرانە دەدوێن.



**ڕوون: ڕیفۆرم و ڕیفۆرمی ئاینیی چیە؟**

**تەحسین حمە غريب** : لەڕاستیدا گەر بمانەوێت چەمکی ڕیفۆرم بەتەنیا وەربگرین ڕەنگە بەوئاسانییە نەگەینە ئەنجامێك لەبەرئەوە دەبێت ووشەی ڕیفۆرم ببەینە پاڵ شتێکی تر بۆئەوەی ڕێگە کەمان کورت ببێتەوە ، بەڵام تەنیا باسی ڕیفۆرم بکەین بەمانا گشتییەکەی، ڕیفۆرم بریتیە لە جۆرێکی تر دارشتنەوەی پێکهاتەی هەر شتێك بەبێ ئەوەی هیچکام لە پارچەکانی ئەو شتە کەم بکەیتەوە ، بۆنمونە  شتێك کۆمەڵێك پارچەی تیابێت ، ئەو پارچانە جارێکی تر تەرتیبیان ئەکەیتەوە بەبێ ئەوەی کە هیچ کام لەو پارچانە بشکێنیت یان بیخەیتە کەنارەوە ئەگەر هەرکام



لەو پارچانە بخەیتە کەنارەوە یاخود بیشکێنیت ئەوە پێی دەوترێت فەساد ، ئەمە لەفەلسەفەی کۆندا زۆرباوە و باسی ئەم بابەتە کراوە ، کەواتە ڕیفۆرم بریتیە لە جارێکی دیکە تازە پێکهێنانەوە و دروست کردنەوەی بونیادی هەرشتێك بەبێ ئەوەی هیچکام لە پارچەکانی بشکێنیت یاخود بیخەیتەکەنارەوە ، وەدەربارەی ڕیفۆرمی ئاینی ، ئێمە ئاینمان هەیەو مەعریفەی ئاینیشمان هەیە، ئەگەر بێت و ئاینە ڕۆژئاواییەکان کەبەمانای (ئیسلام و مەسیحیەت و یەهودیەت) دێت لەفکری دینیدا وای پێدەوترێت، ئاین خۆی یۆخۆی جێگیرە چونکە لەلایەن خواوە لەڕێگەی یەکێك لەپێغەمبەرەکانیەوە بۆنمونە پێغەمبەری خۆمان لەئیسلامدا لەڕێگەی پێغەمبەرمان محمد(د.خ)هاتووە خۆی بۆخۆی جێگیرە بەڵام ئەومەعریفەیەی دوای پێغەمبەر ،بێجگە لەپێغەمبەر لە غەیری ترەوە دەربارەی ئەم ئاینە دروست دەبێت بەگوێرەی زەمەنەکان گۆڕانکارییان بەسەردادێت ، چونکە هەم زەمەن جێکەوتی لەبیرکردنەوەی مرۆڤەکاندا هەیە و کەڕۆژگار ئەڕواو مێژوو ئەڕوا و هەمیش زۆرێك لەبابەتە ئینسانیەکان چ ئاین چ غەیرە ئاین پابەندن بەسیاقێکەوە و پابەندن بەمەرجێکەوە بەزەمان و مەکانێکەوە کەتیایدا ئەم بیرو باوەڕانە یائەم مەعریفانە دروست دەبێت ، کەواتە مەعریفەی ئاین جیایە لە ئاین خۆی بەپێی زەمەنەکان وە بەپێی کۆمەڵگاکان وەبەپێی کەسەکان گۆڕانکاری بەسەردا دێت ، یاخود دەتوانین بڵێین هەرکەسەو جۆرێك لەخوێندنەوەی بۆ مەعریفەی ئاینی هەیە ، ریفۆرمی ئاینی بریتییە لە دەست کاری کردنی ئەم مەعریفەئاینیە نەك خودی ( ئاین ) بەگوێرەی سەردەمەکان و بەگوێرەی کۆمەڵگاکان

**گۆڤاری ڕوون**: کەواتە ڕیفۆرم لەتێگەیشتنی دەقەکان دەکرێت نەك لەخودی دەقەکان ؟

**تەحسین حمە غریب** : واتە مەعریفە لەبری خودی ئاین ، چەنکە خودی ئاین جێگیرە و وە ئەو ئەزموونەیەلە کەخودا وەا (جل جلالە)ە وەهاتووە، بۆیەکێك لەبەندەکانی کەپێغەمبەری خودایە بەڵام ئەوانەی دیکە چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن وەچۆن لێی تێدەگەن کەئەمەگەورەترە لە تەنها زانین مەبەستەکە تەنها زانین نییە ، زانین دەستکاری ناکرێت بەڵکو ناسینە ، تێگەیشتنەکە لەمە خۆی بۆخۆی بتەوێت و نەتەوێت گۆڕانکاری بەسەردا دێت بەڵام هەوڵی ئەوە بدرێت کە ئەم تێگەیشتنە بەشێوەیەکی وورتر و شیاوتربێت بۆئەوەی ماهییەتی و چییەتی ئەو ئاینە هەوڵ بدرێت پارێزگاری لێ بکرێت .

**ڕوون: پێت وانیە بەرینی مەودای کارکردنی ئیسلام و زەمەن دێژییەکەی زیاتر داخوازی ئەوێت کەڕیفۆرم لەمەعریفەی ئاینیدابکرێت؟**





**تەحسین حمەغریب** : بونیادنانەوەی مەعریفە پەیوەست نییە بەئاینەوە لەهەموو کایەکانی دیکەشدا بوونی هەیە ، بۆنمونە لەفەلسەفەشدا هەر بەهەمان شێوەیە ، ئەو فەلسەفەیەی کەئێستا بوونی هەیەهەرگیز فەلسەفەی سەردەمی یۆنان نییە وەهونەریش هەر بەهەمان شێوەیە ، زمانیش هەر بەم شێوەیە کایە ئینسانیەکان بەشێوەیەکی گشتی چونکە پابەندن بەو سیاقەی کەتیایدا دروست دەبن وەئەو زەمان و مەکانەی تیایدا دروست دەبن وەئەوەی عاقڵەکانی ئەم سەردەمە چۆن بەباش دەزانن چۆن لێکی ئەدەنەوە ئەمە لەسەر دەمێکەوە بۆسەردەمێکی دیکە دەگۆڕێ لەبەر ئەوە هەمووکایەکان بتەوێت و نەتەوێت گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە و وەدێت هەروەها بابەتە ئاینەکەش کەواتە ڕیفۆرم تایبەت نییە بەئاینەوە وەلەبنەڕەتدا و ڕیفۆررمی ئاینی یەکێك لەڕیفۆرمەکانە.

**گۆڤاری ڕوون: باشە بەڵام ئاین زیاتر پێویستی پێیەتی چونکە کار لەسەر بوای زۆرتر دەکات وەدەیشیەوێت بۆزەمەنێکی درێژ تر بمێنێتەوە......؟**

**تەحسین حمەغریب** : ڕەنگە یەکێك لە ڕیفۆرمەکانی ئاین ئەوەبێت کەدەستکاری ئەم دێڕە بکرێت واتە مەرج نییە ئاین لەهەمووسەردەمەکاندا ، هەمووڕۆڵەکان ببینێت بۆنمونە ئەگەر لەقۆناغەکانی لەمەوپێشدا ئەگەرئاین ڕۆڵی پزیشکی بینیوە یان ڕۆڵی ئیداری بینیوە یان ڕۆڵی کایەکانی تری بینیوە ئێستا ئەمانە بۆخۆیان سەر بەخۆییان وەرگرتووە لەئاین واتە کایەیانێکن زاستانێکن لەئاین جیابوونەتەوە سەربەخۆییان وەرگرتووە، ئێستاڕۆڵی ئاین نیە ڕۆڵی ئەم بابەتانە ببینێت، ئێستا ماهیەتی ئاین باشتر بەجیایی لەوانی تردەردەکەوێت، کاتێك



کۆمەڵێك شت تێکەڵن بەیەك لێکیان جیائەکەیتەوە وەهەرکام لەوشتانە سەربەخۆیی خۆیان وەردەگرن، بیهێنە بەرچاوی خۆت گەنم و برنج تێکەڵ دەکەیت کاتێك لێکیان جیادەکەیتەوە (برنجە کەش و گەنمەکەش) بە سەربەخۆیی خۆیان دەردەکەون ، لەبەر ئەوە یەکێك لەریفۆرمەکان لەم کات و سەر دەمە بریتیە لەوەی کەئەوانەی مامەڵەیان لەگەڵ ئایندا هەیە لەوە تێبگەن کەئاین لەم سەردەمەدا ڕۆڵی کایەکانی تر نابینێت بەڵکو ڕۆڵی ئاین دەبینێت و وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کەتەنها بەئاین وەڵام دەدرێتەوە و هیچ شتێکی تر ناتوانێت وەڵامیان بداتەوە.



**گۆڤاری ڕوون:** لەكتێبی ئیسلامی كوردی و ڕیفۆرمی ئاینیدا باس لە سەربەخۆبوونی بەهاو بوارەكان دەكەیت لەوانەش مەسەلەی ئەخلاق كە دەڵێیت (چۆن میوەیەك كەپێدەگات و لەلقەكە جیادەبێتەوە ئاواش ئەخلاق لەئاین سەربەخۆبووە، واتە دەكرێت كەسێك ئاینداریش نەبێت و بەئەخلاق بێت) لەپاش سەر بەخۆبوونی ئەم بەهایانەوە چۆن پێناسەی ئیسلام بكەین ؟

**تەحسین حمە غریب** : لەڕاستیدا نەك تەنها ئەخلاق وەك لەپێشتریشدا ئاماژەم پێدا زۆرعیلمی تر هەبووە ، زۆرێك كایەی تر هەبوون لەپێشتردا وەك بەشێك بوون لە ئاین ، ئاینەكان پشتگیری ئەوەیان كردووە ، بۆنمونە لەسەردەمەكانی پێشتردا كەسێك قەد نەیتوانیوەپزیشكی بكات هەتا لایەنی ڕۆحی بەهێز نەبووبێ و ئەگەر پەیوەندی بەئاینەوە نەبووبێ یان لەبواری فەلسەفەدا كەسێك نەیتوانیوە لەگەڵ ئایندا نەبووبێت و سوهرەوەردی لەپێشەكی زۆرێك لەكتێبە كانیدا وەنمونەی یەكێك لەكتێبەكانیدا دەڵێت (ئەوكەسەی چل ڕۆژ بەڕۆژوو نەبێت ، نابیچت ئەم كتێبەی من بخوێنێتەوە ) كەكتێبێكی فەلسەفیشە ، ئەبینیت لەسەردەمانی پێش ئێستا زۆربەی كایەكان پەیوەندی بە ئاینەوە هەبووە ، بەڵام ئێستا هەركام لەوانەجیابوونەتەوە ، مەسەلەی فەلسەفە سەربەخۆیی خۆی وەرگرتووە ، پزیشكی سەربەخۆیی خۆی وەر گرتووە ، ئابووری (سەر بەخۆیی خۆی) وەر گرتووە و ئەخلاقیش بەهەمان شێوە ، ئە مە مانای ئەوەنییە كە ئاین پشتگیری ئەوانە ناكات ، واتە جیان لەئاین بەڵام ئاینیش بەشوێن كەووتوانی دەڵێت بۆنمونە ئیسلام بەشوێن كەووتوانی خۆی دەڵێت ئابووری باش بەكار بهێنن ، پزیشكی باش بەكار بهێنن و فەلسەفە باش بەكار بهێنن هەروەها ئەخلاقیش بۆخۆی بوونێكی سەربەخۆی هەیە واتە ئەكرێت كەسێك دیندار نە بێت و خاوەن ئەخلاقیش بێت ، بەڵام ئاین پشتگیری ئەخلاق دەكات واتە لە سەردەمە كانی پێشدا ئەخلاق بەشێك بووە لەئاین بەڵام لەم سەردەمە نوێیەدا بەهۆی ئەو گۆرانكاریانەی ڕوویان داوە، ئەخلاق بەشێك نییە لە ئاین بەڵكو ئاین پشتگیری ئەخلاقە ، ئێستا ئاین بەشوێن كەوتوانی خۆی دەڵێت كەسانێكی بە ئەخلاق بن بەڵام پێناسەی ئەخلاقیان بۆناكات چونكەخۆیان دەزانن ئەخلاق چیە وچۆنە هەتائەوەی پێغەمبەر ( د.خ ) ئەفەرموێت (من هاتووم ئەخلاق تەواو بكەم جوانییەكانی ئەخلاق تەواو بكەم ، مەكاریمی ئەحلاق تەواوبكەم ) واتای وایە ئەخلاق لەدەرەوە ی ئاینیش بوونی دەبێت پێغە مبەر هاتووە تەواوی بكات ، مەبەستەكە ئەوەیە كە مرۆڤەكان دەكرێت بەئەخلاق بن وەخۆشیان دەزانن ئەخلاق كامەیە بەڵام كاتێك كەبوویت بەكەسێكی ئاینی ، ئاینەكە وایان لێدەكات كە زۆر تر هۆگری بابەتە ئەخلاقیەكان بن ، وەكو وتم هەریەكەیان سەربەخۆیی خۆیانیان لەئاین وەرگرتووە بەڵام دووروو نزیكیشیان لەئاین فەرق دەكات، بۆنمومە زانستی ئیدارە



دوورترە لە ئاینەوە هەتا ئەخلاق ئەگەر هەردوو کیشیان سەربەخۆن، لەبەرئەوەی ئەخلاق زۆر زنزیکە لەڕۆحی ئاینەوە زیاتر بابەتە ئەخلاقیەکان لەگەڵ بابەتە ئاینیەکان یەکدەگرنەوە ، وەهە ر لەبەر ئەمەشە حوکمە ئاینیە کان و دوا ئاینیە کان زۆر تر داوا مان لێدەکەن پشتگیری بابەتە ئەخلاقیە کان بکەین رەنگە بەشێکی زۆر کەم باسی ئەو کایانەی تر ی تێدابێت ئاین بەلاّم بەشێکی زۆری پانتایی فراوانی بریتی بێت لە با بە تە ئاینیە کان بەلاّم ئەمە ئەوەناگە یەنێت ئەخلاق سەر بە خۆبێت وە یە کێك لە داهێنانە کانی مرۆڤی ئەم سەردەمە کە کردوو یە تی کە سە لماندوویە تی ئەخلاق تە نانەت ئا ینیش نەبێت ئە خلاق بوونی هەیە ، بەلاّم جیاوازی مرۆڤی ئایندار لەگەڵ مرۆڤی بیّ ئاین ئالەو خاڵەدایە کە ئایندار ئاینەکەی پێی دەڵێت زۆر تر یەئەخلاق بە ، زۆر تر هۆگری ئەخلاق بە واتە نزیکیەکی سەیر هەیە لە نێوان ئاین و ئەخلاق .

**گۆڤاری ڕوون : پەیوەندی نێوان ڕیفۆرم و داهێنان چییەکامیان دەبێتە هۆی ئەوەی دیکەیان ؟**

**تەحسین حمە غریب** : لەڕاستیدا داهێنانیش چەمکێکی فراوانە واتە داهێنانی هونەریمان هەیە داهێنانی کایە زانستیەکانمان هەیە ، داهێنان خۆی بۆخۆی وەك ئیقباڵ لاهوری دەفەرمووێت (خودی داهێنان ژیانە ) تەنانەت ئەو خوێندنەوانەی بۆژیاننامەی پێغەمبەری خودا ئاوایە کەئەفەرمووێ (پێغەمبەر هاتووە ئێمە بانگ بکات بۆژیان ) (اذادعاكم لما يحيكم ) دەڵێت ئێوە وەلاّمی پێغەمبەر بدە نەوە لەقورئاندا هاتووە ، کا تێك کە با نگتان دە کات بۆئەو شتەی کە ئەتان ژیەنێت بۆژیان ، وەئە فەرمووێت ژیان لەبنە رەتدا واتە داهێنانی شتی نویّ ، شتێك کە پێشتر نییە ئەگەر من ئەوە ی پێشتر دووبارەبکەمەوە واتە من بەس هەناسەم داو زیندوو بووم نە ژیاوم ، ژیان جیایە لەگەڵ زیندوویەتیدا ، بەداخەوە دینداران لەسەردەمە کانی رابردوودا بەتا یبەت لەم دوو سەدەیەی رابردوودا واتێگە یشتبوون کە بنەنەمای دینداریی بریتییە لەوە ی کەتۆ دا هێنان نەکە یت چونکە ئەگەر داهێنان بکەیت ئەوە (بيدعه) ت کردووە ، شتێکت داهێناوە لە سەردەمە کانی لەمەو پێشدا نەبووە، لەکاتێکدا خودی ئاین واتە داهێنان، واتە داهێنانی شتێك لەوە و پێش بوونی نە بووە واتە ژیان، لەبەر ئەوە بە بۆ چوونی من ڕیفۆرم بەبیّ داهێنان ناکرێت بەڵکو خودی ئاینیش بە بیّ داهێنان ناکرێت ، ئەگەر ئاین بریتی بێت لەدووبارە کردنەوەی لەوە و پێش ئەوە ژیان نیە واتە ئەوە ئاین نیە، ئەوە تەنها دیوێکی دەرەوەی ئاینە کەجێگیر بووە بۆهەموو سەردەمەکان هیچ گۆرانکاریەکی تێدانییە ، ئیتر چێژی ئیمانی تێدانییە چێژی ڕووحی تێدانییە چێژی عیرفانی تێدا نیە ، عیرفان و مەعنەویەت کەرووحی ئاینە واتە تازە بوونەوە ، لەبەر ئەوە دەبینیت هەموو ئەدیبەکان ئەوانەی کەمسوڵمان بوون دینداربوون داهێنانیان بووە ، یان عاریفی



گەورە بوون داهێنانیان هەبووە ، واتە شتێکیان وتووە کە لەسەر دەمەکانی لەوەو پێشدا نەبووە و نەو تراوە ، هەر بەمەش ژیانی دینیی درێژە دەکێشێت هەتا قیامەت ئەروا ، ئەگەر تۆ شتێکی تازە دانەهێنیت ئەوە ژیانی دینیی دەوەستێت و ناتوانێت تا قیامەت بەردەوام بێت بۆ نمونە ئاینی ئیسلام بۆئەوە هاتووە کە تا قیامەت بەردەوام بێت .

**گۆڤاری ڕوون: لەقۆناغە جیاجیاکانی سەردەمدا داهێنان لەکوێدا لەچ سنورێکدا کۆتایی دێت ؟**

**تەحسین حمه غریب** : بەدڵنیاییەوە تۆ دەبێت هەوڵی داهێنان بدەیت ، نابێت سنورێك بۆخۆت دابنێیت ، مەگەر توانینەکانی خۆت بەسنورە ، واتە ئینسان توانینە کانی دیاری کراوە هەموو شتێکی لێ نایەت ، واتە من دەبێت ئەوەندە هەوڵی داهێنان بدەم هەتا تواناکانم ڕێگەم ئەدات ، دوای ئەوە کە نەمتوانی ئیتر خۆی بۆخۆی نەتوانینم ئەبێتە سنور بۆداهێنانم ، ئەگەرنا خۆی لەسەرەتاوە، سنورێك بۆداهێنان دابنێیت ئەوا خۆی بۆخۆی بکوژی داهێنانە ، ئاین لە پەنا داهێناندا نیە تاوەکو ملۆزمی بێت و ڕێگری بێت ، بەڵکو لەپێش داهێنانەوەیە وەکو چۆن سەرچاوەی کانییەك، سەرچاوەیە بۆ ئەوئاوەی کەلێوەی دەردەچێت ، واتە ئەو سەرچاوە ڕێگر نیە لە ئاوەکە بەڵکو پاڵنەرە بۆئاوە، ئاینیش هەروەها پاڵنەرە بۆداهێنان نەك ڕێگر بێت لەڕێگە داهێنان ، کەئێمە داهێنان بشوبهێنین بەئاوێك ئەوا ئاین



ئەوسەرچاوەیە کەئەو ئاوە بەردەوامی دەکات وادەکات ئەو داهێنانە بەردەوامبێت ، ئەگەر نا ئەگەر ئاین بریتی بێت لەرێگرێك لەرێی داهێناندا وەك ئەو ڕێگرەی کەلەرێی سەرچاوەی کانییەکدا خرێت بەرئاوە، بۆ ئەوەی نە جوڵێت ، ئەوکاتە ئەبێتە هۆی ئەوەی ئاوە کە بگە نێت کە ئاوەکە وەستاوە دەگەنێت ، لە بەر ئەوە بەدڵنیا یەوە داهێنان نابێت سنوری هەبێت مە گەر توا نینەکانی ڕێگربێت لەرێی ئەوەی نەتوانێت هەموو داهێنانێك بکات .

**گۆڤاری ڕوون:** پێت وانیە ڕێگریەکی ڕیفۆرم تێکەڵکردنی {ڕەهاو یان ڕێکخراو} ە ی بێت لەجێبەجێکردنی پەیامەکانی خوادا و ئەحکامەکانی بەبێ جیاکاری و هێنانەوەی ڕووداوو چارەسەرەکانی {فەرهەنگی سەردەمی پێغەمبەر (د.خ)} بەکۆپی و بەبێ گۆڕانکاری ؟





**مامۆستا تەحسین :** ئەگەر مەبەست لەسنووردار مرۆڤ بێت رەهاش ئاین بێت بە مانا فراوانەکەی و میتا فیزیکیەکەی و ئەوەی دەکەوێتە دەرەوەی ژیانی مرۆڤ ئەوەدەبێت ، نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت یەکێك لەجوانترین نهێنی رازەکانی مرۆڤ بریتیە لەو ( ملتقی) بەیەکگەیشتنەی لەنێوان ئەوشتە سنورداره کەمرۆڤە لەگەڵ ئەورەهایەی کەجیهانی خوایەتی خوایە رووی داوە لە مێژوودا وەو بەردەوام روو دەدات ، ئەمە واتە رازە کانی خودا {جل جلاله} ووتەکانی خودا {جل جلاله} وداواکانی خودا بۆ ئێمە ی مرۆڤ بەجۆرێك لەجۆرەکان گەیشتووە وەئەتوانین بڵێین ئەمە نەفەسی ژیانی ئێمە بووە لە مێژوودا ، بەبۆچوونی من گەورەترین ئەو هەڵانەی کەخەڵکی هەتا ئەوانەی لەبواری رۆشنبیری و فەلسەفەشدا ئیش دەکەن بەسادەیی بیرلەم بابەتە دەکەنەوە و سەیری مێژووی هەموو مرۆڤایەتیان نەکردووە تەنانەت لەخێڵە سەرە تاییە کانەوە کە هەزاران ساڵ پێش ئێستا ژیاون، هەرگیز پەیوەندی ئاسمان و زەوی نەپچراوە، هەرگیز پەیوەندی ڕەها لەگەڵ سنوردار نەپچراوە و بەڵام کێشەی ئەم رەهایە بەنیسبەت ئێمە کەلەباسی ریفۆرمدا ئەمەمان بۆ دروست دەبێت ئەوەیە کە دێتە ناو سنوردارەوە دێتە ناو شتەکانی ئێمەوە واتە دێتە ناو بیرکردنەوەی ئێمەوە و دێتەناو زمانی ئێمەوە وە دێتە ناو مێژووی ئێمەوە ناو ژیانی ئێمەوە وە دێتە ناو کایەکانی ئێمەوە، ئەوکاتە بەرگی ئێرە لەبەردەکات ، ئەوەیە کە مەولانا دەفەرمووێت{صورت لەبێ صورەتی } وێنە لەبێ وێنەیی دروست دە بێت،ئیتردەبێتە وێنەیەك لێرەبوونی دەبێت ،ئەوکاتە پابەند دەبێت بەسنورەکانی ترەوە بە سنورەکانی ناودونیای سنوردارەوە واتە لەناو دونیای مرۆڤەوە ، لەبەرئەوە کاتێك وەحی هاتە ناو مێژووی مرۆڤایەتیەوە ئیتر خۆی بۆخۆی وەحی ئەمەی قبوڵ کردووە ، خودا {جل جلاله} ئەوەی لەوەحی داناوە کە بەپێی توانا کانی مرۆڤ بجولێتەوە بەپێی تێگە یشتنەکانی مرۆڤ بجولێتەوە و بەپێی زمانی مرۆڤ ، واتە خودا ئەرکێکی بەسەر ئێمەدا نەداوە کەلە سەرووی توانای ئێمەوەبێت ، لەبەر ئەوە ئەم وەحییە کەهاتەناو ژیانی ئێمە ی مرۆڤەوە بۆنمونە ئەحکامەکانی شەریعەت کەهاتە ناو ژیانی ئێمەی مرۆڤەوە ئیتر پابەند ئەبێت بەو مەرج و پێکهاتەو پێکهێنەرانەی کەلە ناو ژیانی ئێمەدا بوونی هەیە ، بۆنمونە حوکمە فیقهییەکان پابەند دەبێت بەو مومکیناتە ی کەلەناو ژیانی ئاسایی ئێمەدا بوونی هەیە کە ئەبێ یاساکانی ناو مرۆڤ چۆن بن ، لەبەر ئەوە ئەمەش بەپێی زەمەنەکان دەگۆڕێت ، ئەبێ تێگەیشتنی ئێمەش لەو رەهایە بۆنمونە لەو شەریعەتە گۆران کاری بەسەردا بێت ، ئەسڵەن ئەوە پێچەوانە دەبێتەوە لەگەڵ شە ریعەتدا ئەگەر تێگەیشتنی ئەمڕۆمان بۆشەریعەت هەمان فۆرم بێت کەلەسەردەمی پێغەمبەردا بوونی هەبووە ، ئەبێ ئەو گۆرانکاریانەی کەژیانی





ئێمە بەسەر ئێمەدا دەیسەپێنێت  ئەوەندە ورد بیر لەم بابەتە بکەینەوە کەهەوڵ بدەین داوای خودا {جل جلاله} خۆی چۆنە بۆئەم سەردەمە لێی تێبگەین نا ئەگەرنا فۆرمەکەی سەردەمی لەمەو پێش بمێنێتەوە لەم سەردەمەدا داینێینەوە ئەوا بەپێچەوانەی ئامانجەکەی خواوە جولاوەتەوە بەپێچەوانەی ئەوەی کە خودا داوای کردووە بەپێچەوانەی (مقصد) ە کەی خواوە جولاوینەتەوە ، بۆنمونە بۆئەوەی بەرجەستەی کەم خوا لەچەندین شوێنی قورئاندا وە لەچەندین فەرموودەی پێغەمبەری خودادا هاتووە ئەوە کەداوای   دادپەروەریی دەکات، تێگەیشتنی مروڤەکان بۆداد پەروەری بە پێی سەردەمەکان گۆران کاری بەسەردا دێت و هاتووە واتە کاتێك ئێمە دەتوانین داواکەی خودا جێبەجێبکەین کەبریتیە لەجێبەجێکردنی دادپەروەریی کەبەپێی ئەم ڕۆژەدادپەروەری جێبەجێ بکەین واتە بەپێی ئەم ڕۆژە لێی تێبگەین لەبەر ئەوەهێنانی فۆرمی سەردەمەکانی تر بۆئەم سەردەمە ستەم دەکەین لەداوایەکی خودا،چونکە نادادپەروەری بەناوی ئەوەی کە خوا داوای دادپەروەریی دەکات  ئەهێنیەناو کۆمەڵگەوە و جێبەجێ دەکەین ، قسەکەلێرەدایە ئەگەر ئێمە بێت و هەمان فۆرمی سەردەموکانی لەمەو پێش بهێنین پێچەوانەی داوای خودا جولاوینەتەوە ، چونکە ئەوە باز بەسەر زەمەندا دەدەین  کەئەمە لەزمانی فەلسەفیدا پێی دەگوترێت (زەمەن پەرستی) واتە شتی زەمەنێك دەبەین  بۆزەمەنێکی تر  باشتر ئەوەیە باشتر ئەوەیە کە ئامانجە سەرەکیەکەی ئەو سەردەمە بهێنین  لەم سەردەمەدا جێبەجێی بکەین بەمەش فەرمانەکەی خودامان جێبەجێ کردووە  ئەگەر نا ئەگەر فۆرمە دەرەکییەکە بهێنین لەم سەردەمەدا جێبەجێی بکەین  بەبیٚ ڕۆحەکەی ئەوە **پێچەوانەی** ئەمری خودا جولاوینەتەوە .

**گۆڤاری ڕوون : جیاوازییە کی زۆر هەیە لە دیاری کردنی ئاستی گۆڕاوو نەگۆڕەکانی دین  وەهەندێك پێیان وایە کەلەدیندا ڕێژەی نەگۆرەکان زیاتر ن پێت وانییە ئەم تێگەیشتەنە ڕێگرێکی گەورەبێت لەبەردەم ریفۆرم کردن  ؟**

**مامۆستا تەحسین :** لەڕاستیدا داهێنانی چەمکی گۆڕاو و نەگۆڕ  (ثابت و متغیر) یەکێکە لەداهێنانەکانی فکری بەشەرەی، خۆ لەقورئاندا شتی وا باس نەکراوە لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا بەهەمان شێوە هەر باس نە کراوە ، لەخوودی ئایندا باس نەکراوە  ئەمە تێگەیشتنی مرۆڤەکانە بەرامبەر بەئاین  وە تێگە یشتنی زاناکانی  ناو ئیسلامە لەئاین ، ئەو دوو چەمکەیان داهێناوە کامە جێگیرە  لە ئایندا و کا مەش گۆڕاوە لە ئایندا ، بەبۆ چوونی من ئەم دوو چەمکە ناتوانن حەقی خۆی بدەن  . بۆ ئەوە ی باشتر پەیوەست بین بە ئاینی خۆمانەوە ئە بێت ئەم دوو چەمکە بگۆڕین بۆدوو چەمکی تر بۆشتی تر کەجێگرەوەی ئەم دوو چەمکەبێت ، لە ڕاستیدا من لە بیرمە جارێك لە



شوێنێك مامۆستا یەك باسی ئەم بابەتەی دەكرد ( گۆڕاو نەگۆڕ)، پرسیارم كرد ووتم مامۆستا نەگۆڕ چیە ؟ ووتی ئەوەی نابێ ت دەستكاری بكەین مادام نەگۆرە ناتوانین دەست كاری بكەین ، كەواتە گۆراوە بۆیە ئێمە دەبێت پارێز گاری لێبكەین واتە ئیمكانی ئەوەی تێدایە كە بگۆڕێت ، ئەمە بەبۆچوونی من ئەم تێگەیشتنە بەشێكە لەو هۆكارانەی كەلەو سەردەمەدا نەیان هێشتبێت فیكری دینی پێش بكەوێت ، دەكرێت كۆمەڵێك چەمكی تر لەبری ئەم دوو چەمكە بەكار بهێنین ، بۆنمونە ناوەڕۆكی ئاین لەگەڵ رووی دەرەوەی ئاین یان جەوهەری ئاین و دیوە ڕووحییە كەی ئاین ، ئەم چەمكەی تر لە سەردەمی هیگڵەوە دواییش لەناو مسولمانانداندا ئیقباڵ لاهوری و كۆمەڵێك فەیلەسووفی تر بە كاریان هێناوە ئەم چەمكە جەوهەری ڕاستە قینەی ئاینە ئەو بەشە ی ئاینە كەلە هیچ سەردەمێكدا خۆی گۆڕانكاری بە سەردا نایات نەك ئێمە پارێز گاری لێبكەین و مانای ڕاتستە قینەی ئاینە ئەوە جیا بكەینەوە لە گە ڵ ئەو بەشەی كەدە بێنە دیوی دەرەوە و فۆرمی ئاین بە پێی زەمەنەكان گۆرانكاریی بە سەردا دێت ، ئە بێت ئێمەی مسوڵمان ئەو بوێرییەی ڕۆژئاوامان ببێت ، ئاخر سەردەمی نوێ لەڕۆژئاوا لەوە وە دەستی پێكردووە كەكانت ئەڵێ (بوێری بیر كردنەوەت هەبێت ) ئێمەی مسوڵمان ئەبێت بوێریی ئەو بیر كردنەوەیەمان هەبێت كە كام بە شەی ئاین یەڕاستی ئاینە وەناگۆڕێت وەمانای راستە قینەی ئاین پێك دەهێنێت ، دەبێت بیناسین و جیای بكەینەوە لەو بەشەی ئاین كەبانەوێت و نە مانەوێت كە بەپێی سەردەمەكان گۆرانكارییان بەسەردا دێت وە ناكرێت لەبەر خاتری ئەوە من ترسم هەیە ئەویش كە بڕیارە بیگۆرم هەر بیهێڵمەوە كێشەكە لێرەدایە ، ئێستا مسولْنانان لەترسی ئەوەی نەبادا ئاینیان لەدەست دەر بچێت ئەو شتەی كە بڕ یارە بیگۆڕن ناوێرن بیگۆڕن ئەمەش تەنها ترسە ، تەنها دیدێكی سایكۆلۆجییە نەك مەعریفیی و فیكریی كە ئەمەش وا دەكات لەگەڵ سەردەمدا نەینەوە ، ئیقباڵ لاهوری قسە یەكی زۆر جوانی هەبە لەم بابەتەدا دەڵێت {دوای ئەوەی خودا دواین پێغەری نارد ، ئیتر چاوەروانی ئەوە ناكەین كە پێغەمبەرێكی تر بێت ، وە ئێمە دڵنیاین كەپێغەمبەرێكی دیكە نایەت و ئیتر ئێمە ئازاد ترین مرۆڤی سەر زەوین لەبەر ئەوە عەقڵی خۆمان زیاتر دە كەینەكار چونكە ئیتر خەتمی نبوەت بووە ، ئەسڵەن یەكێك لە چاكەكانی ئیسلام ئەمەیە كەپێی وتین ئیتر ئێوە مەترسن و دڵنیابن پێغەكبەرێكی تر نایەت خۆتان هەوڵ بدەن و رێگەی پێغەمبەرەكان بگرن و خۆتان هەوڵ بدەن كامە باشە بۆ دینتان ئەوە بكەن ، وكامە باشە بۆ دنیاتان ئەوە بكەن بەئیختیاری خۆ تان چەند پێتان دە كرێت ئیرادەو ویستی خۆتان بەكار بهێنن بۆ گۆرانكاریی ئەمە یەكێكە لەو چاكانەی كە ئیسلام لەگەڵ ئێمە كردووەیەتی ئانیداری لە ئێمە داوا ناكات كە ئێمە كەسێكی



جەبری بێن و بەهیچ شێوەیەك دەست کاری واقیع نەکەین و دەستکاریی خۆمان نەکەین گوایە ئەمە ویستی خوایی بێت ، نادینداریی فێرمان دەکات کە زۆرتر ئیختیاری خۆمان بەکار بهێنین زۆرتر ئیرادەی خۆمان بەکار بهێنین زۆرتر عەقلی حۆمان بەکار بهێنین ، لەبەرئەوە دەبێت ئازا بیت و ئەوبوێرییە مان بێت ، زۆر بەراشکاویی دەڵێم مسوڵمانان لانکەم ڕۆشنبیرەکانی مسوڵمانەکان و(مفکر)ە کانی مسوڵمانان نەگەنەئەوەی کەبوێری ئەوەیان بێت سەیری ئاین بکەن ئەڵبەتە بە خۆشەویستی ئاینەوە لەبەر ئەوە ئاین خۆیانی خۆشتر دەوێت ، بۆئەوەی پارێزگاری لێبکەن هەوڵ بدەن کام بەشەی بواری مانەوەی تێدایە بمێنێتەوە و کام بەشەش ئەکرێت دەستکاری بکرێت بادەستکاری بکرێت وە ترسیان نەبێت چونکە ئەوە بەشێك نیە لەئاین ، بۆنمونە کەمن شتێکم هەیە لەماڵەوە کانزایە لەبەر ئەوەی کە خۆشم ئەوێت نابێت ڕێگە بدەم ژەنگ بیخوات دەبێت بەردەوام پاکی بکەمەوە و هەر لەبەر ئەوەیە کە عاریفەکان وتویانە ( ئێمە ئاوێنەیەکی ژەنگاویین ئە بێت پێغە مبەری خوا بەینەوە) ، پێغەمبەر لەناو ئەو ئاوێنەدا دەرکەوێت دەی بەو ژەنگەوە دەرناکەوێت دەبێت ئاوێنەکە باش پاك بکەینەوە ، بۆئەوەی باش دەربکە وێت لەبەر ئەوە کامە ژەنگە زۆربەئاسانی لای دەبەم ، بۆئەوەی باشترو چاکترو پاکتروبێت وەتا پاکتربێت باشتر ئاینەکەم تیشك دەداتەوە باشتر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر پیشان دەداتەوە ، لە بەر ئەوە دەبێت زۆر بەبوێرانە دەستکاری ئەم بابەتە بکەین.

**گۆڤاری ڕوون : ئەمە کە باستان کرد وەك ئامرازێکە بۆ گە گەشەدان بە فیکرو عیرفانی ئیسلامی ، پرسیار دێتە پێشەوە لێرەدا ئایا پە یوە ندی فیکرو عیرفانی ئیسلامی چیە ؟**

**تەحسین حمە غریب :** بەدڵنیاییەوە هەموو ئاینێك لە سەرەتاوە ئەزموونێکی عیرفانیی هەبووە وە لەسەردەمی پێغە مبەرەکاندا کە دواییان پێغەمبەری خۆمان بوو، شتێك هەبوو لە عیرفان گەورەتر کەپێی دەگوترا {نبوەت} کە ئەویش ئەزموونێکی ڕۆحیی بووە وە ئەزموونێکی سەیر بووە ، وەیەکەمجار ئەو پێغەمبەرە ئەزموونێکی بۆ دروست بووە کە خۆیشی نەیزانیوە چییە هەتا پێغەمبەری خۆمان نەیدەزانی و کە کەسێك بۆی دەرکەوتووە پێی فەرمووە بخوێنە ئەویش فەرموویەتی من خوێندەوار نیم من نازانم بخوێنمەوە و خۆی بۆ خۆی ئەمە ئەزموونێکی ڕۆحییە تەنانەت دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە تەنانەت دەچێتەلای وەرەقەی کوری نەو فەل نازانێ ئەمە چییە ، ئەمە رووحی ئاینە دروست بوونی ئەم ئەزموو نەرۆحییە ئاینییە دوایی پێغەمبەران لەلای عاریفان و پیاوچاکان لەڕێگەی شتێکەوە کردوویانە پێی دەگوترێت عیرفان ، عیرفان ڕووحی ئاینە (سیدحسین نسر ناوی دە نێت دڵی ئیسلام)، بۆکەسی عیرفانی ئاین خۆشەویسترین شتە کە



بەپێی دینداریی كەسەكان دەگۆڕێت ، دەكرێت لای كەسێك ئەز موونێكی زۆر سادەبێت بەڵام لای كەسێی تر ئەزموونێكی قوڵتربێت ، دەبێت ئینسان هەوڵبدات هەتا ئەم ئەزموونە ڕووحییەی بۆدروست بێت ، شتێكی عەنتیكە هەیە لەناو دیندا لەناو دینە كاندا ئینسان تائەو ئەزموونە ڕۆحیەی گەورەتربێت داهێنانی زۆرتر دەبێت ، چ داهێنانی فكری چ داهێنانی هونەریی بۆیە نابینین عارفێكی گەورە هەبێت شاعیر نەبێت وەنابینیت هیچ كام لەوانە كەئەزموونێكی ڕووحی گەورە یان هەبێت داهێنانێكی فەلسەفی یاخوود داهێنانێكی فیكری یان داهێنا نێكی هوونەری شتێك لەو بابەتەیان نەبێت ، لەبەر ئەوە پەیوەندیەكی ڕاستەوانە لەنێوان عیرفان و فیكر لەژیانی ئایندا هەیە و ئینسان تالایەنی ڕووحی بەهێزتربێت هەتا مەعنەویاتی بەهێزتربێت ، تاجۆرێكی تر ڕوانینیان بۆدروست بێت جۆرێكی تر داهێنانی فیكری و فەلسەفیان بۆدروست دەبێت ، بۆنمونە هەر لەسەردەمی نوێدا كەلەم چاوپێكەوتنەدا زۆر ناویمان هێنا ئەویش ئیقبال لاهووریان دەبینین پیاوێكی ڕۆحانی گەورەیە لە و لاشەوە فەیلەسوفێكی گەورەیە لەمێژووشدا بەهەمان شێوە بووە، هەر لەناو كوردە كاندا كاك احمد ی موفتیزادە پیاوێكی ڕۆحانی گەورەیەو داهێنانی فیكریشی هەیە ، مامۆستا ناصری سوبحانی پیاوێكی رۆحانی گەورەیە داهێنانی فیكریشی هەیە ، مامۆستا سعیدی نوورسی پیاوێكی ڕڕۆحانی گەورەیە بەهەمان شێوە داهێنانی فیكریشی هەیە بەوشێوەیە ، پەیوەندیەكی ڕاستەوانە لەناو ژیانی ئایندا لەنێوان داهێنانی ڕۆحی یاخود كامڵبوونی ڕووحیی و پێگویشتنی ڕووحی و هەروەها دروست بوونی بیروو باوەری فەلسە ڤ و ئایدیاو فیكرەی فەلسەفە بوونی هەیە ، من باوەرم وایە دواجار ئەو ئەزموونە ڕووحییە قووڵەی بۆئینسان دروست دەبێت وا دە كات گەردوون بە جۆرێكی تر ببینێت ، ئەو دیوانە ببینێت كەئینسانی تر نایان بینێت و بۆنمونە ئەگەر خەڵكی ئاسایی تەنها گەردوون وا بهێنە پێش چاوی خۆیان كەخانووەیەكە و ئەگەر خەڵكی ئاسایی تەنها لەروو یەكیەوە تەنها سەیری ئەم بابە تە بكەن ، تەنها دەرگاو پەنجەرە كە ببینن ئەو دەڕوا لەو دیویشەوە دەی بینێت ، ئەوشتانە دەبینێت كەخەڵكی تر نایان بینێت ئەوە داهێنانی فیكریی بۆ دروست دەبێت لەبەر ئەوە پەیوەندییەكی ڕاستەوانە هەیە لەنێوان فیكرو عیرفاندا .

گۆڤاری ڕوون : دەربارەی نوێبوونەوە لەئایندا (د.سید حسین نسر) بەباوەڕی خۆی كە سانی وەك ( محمد عبده و سید قوتب و سعید نوورسی محمد فەتحولاگولەن)، بەتایبەتیش دەڵێت بەگەنجی لەگەڵ سید قوتب ئیێوارەك گفتووگۆیەكی درێژمان دەربارەی ئەم بابەتە كردووە وەدواتر دەڵێت بەشێكی گرنگی نوێبوونەوە بریتیە لەوەی تەكنەلۆژیای ئەورووپا و ئەخلاقی



ڕۆژئاوا تێکەڵ بە یەکدی بکەیت ، دەتوانین بڵێین مادییەتی ڕۆژئاواو مەعنەویاتی ڕۆژهەڵات تێکەڵ بەیەکدی بکەین ئەو کات پێشکەوتن بەدی دێت ، تۆ ڕات چییە دەربارەی ئەم ڕایە ؟

تەحسین حمە غریب : لە ڕاستیدا سوننەتگەرا کان خزمەتێکی گەورەیان کردووە بەفیکری ئیسلامی وەك سید حسین نسر و هەتائەوانەش نزیکن لێیانەوە مەرج نییە خۆیان بن بونمونە شڤان رینب گوروون و ئانمار یشمیل کۆمەڵێك فەیلەسوفن کەدیوی رووحی ئیسلام و فەلسەفەی ئیسلامیان جارێکی تر بەسەردەمی نوێ ناساندەوە ، بۆنمونە سیدحسین نسر فەلسەفەی ئێرانی جارێکی تر بردەوە ڕۆژئاوا وەهوونەری ئیسلامی جارێکی تر زیندووکردەوە ، بەڵام بەبۆچوونی من خەوشی ئەم فەیلەسووفە سوونەت گەرایە لەوانەش سید حسین نسر ئەوەیە کە پەیوە ندیەکی میکانیکی لەنێوان سەردەمی نوێ و سوونەتدا دروست دەکەن ، وا دەزانن دەکرێت ئەوەی کەهەر خۆی وتوویەتی کەمن گوێم لە موحازەرەیە بووە وا دەزانێت دەکرێت گوڵ چن بکات ، کام بە شی سەردەمی نوێ باشە لەگەڵ کۆنەکە کەدا کۆی بکاتەوە ئیتر نا زانێ ئەم بەشە نوێیەش خۆی بۆ خۆی دیوی نەبینراوی هەیە ، ئەویش ئەخلاقیاتی خۆی هەیە ئەویش دیوی فیکریی خۆی هەیە ، کا تێك کە تۆ ئەوشتە تازە دەهێنیت لەگەڵێشیدا دیوە ئەخلاقی وفیکریە کەشی دەهێنیت ، بەبۆ چوونی من ئەم مامەڵەیە کەدواجار دەر گێربوون درووست دەکات شەری شوناس دروست دەکات ، شوناسی ئێمە لەگەڵ شوناسی ئەوانەی تردا واتە شوناس جێگەی حەقیقەت دەگرێتەوە ، باشترین مامەڵە ئەوە نییە ئێمە هەر لە سەرەتاوە داینێین کامەهی ئێمەیە پارێزگاریی لێ بکەین کامەش لەگەڵیدا دەگونجێت بیهێنین ، باشترین شت ئەوەیە کە بەشوێن حەقیقەتدا بگەڕێین ، چ لەوەی لەنێو خۆماندا بێت چ لەوەی ڕۆژ ئاواشدا بێت لە دەرەوەی خۆشمان بێت ، پێغەمبەر دەفەرمووێ حیکمەت ونبونی ئینسانی ئیمانداره ، لەهەر شوێنێك دۆزیتیەوە دەبێت وەری بگرێت ، ئیتر لای مسوڵمانێك بێت یان لای نا مسوڵمانێك بێت و حیکمەت تەنها دیوە تەکنە لۆجیاو دیوە دەرەکیەکە نە بە تەنها دیوی رۆحیشی تێدایە ، ئێستا من ئەزموونێکی رۆحی جوانم دەست کەوێت لای بووزا ییەکیش بێت دەبێت سوودی لێ ببینم لای یەهودی و مەسیحیەکیش بێت دەبێت سوودی لێ ببینم ، لەقورئانیشدا بەهەمان شێوەیە ئایەتەکانی قوورئان بەسەر قەشەو راهبە مەسیحیەکاندا دەخوێنرایەوە فرمێسك بەچاوانیاندا دەهاتە خوارەوە (بان فیهیم کسیسین ورهبان) وەك لەقورئاندا هاتووە واتە ئەو چۆن دەتوانێت سود لە ئەزموونی من ببینێت منیش دەتوانم سود لەئەزموونی ئەو وەربگرم مەبەستم ئەوەیە سوونەتگەرایی لەبەر ئەوەی تەنها شوناسی بەلاوە گرینگە تەنها دیوی دەرەوە ، بەبۆچوونی من نا توانێت لەم سەردە مەدا درێژە بەژیانی خۆی بدات





ناتوانێت بچێتە قووڵایی سەردەمی نوێوە نا توانێت بچێتە قووڵای دینیشەوە ، بۆنمونە ئەگەر سەیری سوونەتگەراکانی وەك سید حسین نسر و ئەوانەبکەیت کەمن زۆر بەدوادا چوونی ئەم بابەتەم کردووە دەمێکە خەریکی ئەم بابەتەم هەستم کردووە بۆ نمونە ناچاردەبن لەهێنانی ئیسلامیشدا گوڵچن بکەن بۆنمونە دیوە فەلسەفیەکەی دەهێنن ، دیوە بابەتە عیرفانیەکان دەهێنن بەلام دیوە فیقهیە کە کە بەو شێوەیە زەق نا کەنەوە ، هەندێ رەهەندی تری ئاین هەیە کە لە سەردەمەکانی لەوەو پێش ئاین بووە ئەو ناچار دەبێت نەی هێنێت چونکە بەحسابی ئەو ناتوانێت هەردوو روو کۆبکاتەوە، لەبەرئەوە گوڵچنی دەکات هەندێکی دەهێنێت و هەندێکی وازلێ دە هێنێت ، لەکا تێکدا من بەشوێن حەقیقەتدا بگە ڕێم واش تێگەیشتم ئاینەکەی من بریتییە لە حەقیقەت ئیتر ئەم ترسەم نیە، بەڵکو لەبەر ئەمە ئاین خۆی بۆ خۆی تایبەت مەندێتی جیهانی هەیە دە توانێت لەگەڵ ئەم سەردەمەدا بژی نەك من وای لێ بکەم لەگەڵ ئەم سەردەمەدا بیژێنم بەوەی بیکەمە باڵندەکەی مەلای مەشهورە کەگوتی پەرووباڵی بکەم بۆئەوەی لەو سەردەمەوە بۆئەم سەردەمە ببێتە باڵندەیەکی (معقول) بۆئەم سەردەمە بژی و بشێت ، نەخێر لەم سەردەمە خۆی بۆخۆی بۆشاییا نێکی وا هەیە کە بەم ئاینە نەبێت پر نا کرێتەوە ئەمەیە چەمکی مەعنەوییەت کەمن خۆم بۆخۆم باوەرم وایە ، مەعنەوێت واتە وەلامی ئەوپرسیارانەی لەم سەردەمەدا وە پرکردنەوەی ئەو بۆ شاییانەی ئەم سەردەمە کە بەئاین نەبێت بەهیچ شتێکی تر وەلام نا درێتەوە وە پرنا کرێتەوە ئیتر پێویست ناکات خۆمان بۆخۆمان مامەڵەی میکانیکی بکەین بەئارەزووی خۆمان کامەی گونجاوە بیهێنین و کامەی نەگونجاوە نەیهێنین ، ئەو کاتە ئێمە پێوەرین نەك ئاین ئەوە ئێمەین وەلام دەدەینەوە نەك ئاین لە کاتێکدا ئەوە ئاینە خۆی تنوێتی ئەم سەردەمە دەشکێنێت وەك ئەڵێ تینویەتیان دەشکێنێت و تێرئاویان دەکات. لەبەر ئەوەی ئەو ئیشەی سەید حسین نەسر و ئەوان ئەگەر چاکەی تێدایە وەك وتم بەشێکی برێکی باش ئیسلام دەناسێنێت بەتایبەتی دیوە فەلسەفی و هونەرییەکەی وە دیوە عیرفانییەکەی وە خراپەیەکی تێدایە کە گوڵچن لە ئایندا دەکات ، ئەو شتەی کە بۆ ئەو دەشێ دەیهێنێت و ئەوی تری .

**گۆڤاری ڕوون: چیت بۆ ئەو کەسانە هەیە کە دەیانەوێت لە کتێبە فیقهییەکانەوە فیکر و عیرفانی ئیسلامی بناسن؟**





تەحسین حمە غریب : لە ئیسلامدا زانستەکان خۆیان بۆ خۆیان دابەشکراون ، یەکێك لە زانستەکانی ئیسلام بریتییە لە دابەشکردنی زانستەکان. بەشێوەیەکی گشتی زانستە شەرعییەکان سێ بەشی سەرەکین، بەشێکیان پەیوەندییان بە ڕەفتاری دەرەکی مرۆڤەوە هەیە، سلوکگەران، ئەوە فیقهە، ئەحکامی فیقهە. بەشێکی تریان پەیوەندییان بە لایەنی ڕۆحی ئینسانەوە هەیە، ئەوە عیلمی ئەخلاق و تەسەوف و عیرفان و ئەو بابەتانەیە. بەشێکی تریان پەیوەندی بە لایەنی زیهنی(فیکری) ئینسانەوە هەیە، ئەوە عیلمی عەقیدە و فەلسەفە و کەلام و ئەو بابەتانە دەگرێتەوە. یەکێك لە کێشەکانی ئەو کەسانەی کە مامەڵەیان لەگەڵ ئایندا هەیە،بە(اصطلاح) بانگخوازە لەم سەردەمەدا، دێن تێکەڵییەك لە نێوان ئەم کایانەدا دەکەن ، هەر زانستێك وەڵامی جۆرێك لە پرسیار دەداتەوە. ئێستا لە زانستە نوێیەکانیشدا ، تۆ ناتوانی لە زانستی کیمیا بۆ بابەتە بیرکارییەکان بگەڕێی، چونکە زانستێکی سەربەخۆیە و جیایە، وە تۆ ناتوانی لە فیزیادا مێژووناسێکی باش بیت، چونکە ئەوە زانستێکی سەربەخۆیە و وەڵامی پرسیارەکانی خۆی دەداتەوە. لە زانستە ئیسلامییەکانیشدا هەرکام لەو زانستانە تایبەتن بە شتێك و وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە تایبەتن بە کایەکەی خۆیەوە. ئیتر ئەگەر تۆ بەتەما بیت لەو زانستانەی کە پەیوەندییان بە ڕەفتاری ئینسانەوە هەیە کە ناوی(فقه)ە، بچیت بابەتە ڕۆحییەکان دەربهێنیت، ئەوە وەڵامت ناداتەوە، هەر ئەمەشە وتوویانە لە شافعی ئەم جۆرە پرسیارانە مەکە، خۆ مەبەست ئەوە نەبوو کە خودا نەخواز ئیمامی شافعی کەم بووە، چونکە ئیشی ئەو شتێکی تر بووە. هەروەها بەتەما نەبیت لە دیوە عیرفانی و ڕۆحییەکەوە وەڵامە فیقهییەکانت دەست کەوێت، ئاخر هەشە بە پێچەوانەوە بەتەمایە لای عاریفەکان وەڵامی شەرعی دەست کەوێت، لە ڕاستیدا ئەمیش بۆخۆی کێشەیە، یاخود بەتەمایە لای عاریفەکان وەڵامە فەلسەفییەکانی دەست کەوێت.



بۆنمونە بۆخۆم بەدواداچوونم لای کەسێکی وەك مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی کردووە، مەولانا ئەگەرچی لە لە بواری ڕۆحی و عیرفانیدا پیاوێکی گەورە بووە، ئێمە هەموومان قەرزاری ئەوین لە ڕاستیدا، ڕەنگە کەم کەس هەبێت هێندەی ئەو خزمەتی کردبێت لەم بابەتەدا، بەڵام کاتێك بەراوردی ڕاکانی ئەوم لە بواری فەلسەفەدا کرد زۆر بە لاواز دەهاتنە بەر چاوم، هەر لە ڕاستیشدا وایە. بە بیرم دێت لە یەکێك لە هۆنراوەکانیدا باس لەوە دەکات کە (هەر ئەوەنەی کە تۆ لەبەردەم ئیشێکدا



دەوەستیت و نازانی کامیان بکەیت، ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە تۆ (اختیار)ت پێدراوە (ارادە)ت پێ دراوە، دەی ئەوە بابەتێکی فەلسەفییە، لە کاتێکدا خەڵك وەڵامی ئەو بابەتەی زۆر بە ئاسانی داوەتەوە و ئەمە یەکێك لە بابەتە زۆر سادەکانی فەلسەفەیە، ئەویش ئەوەیە کە تەرازوویەك کە دایدەنێیت، کاتێك کە هەردوو تای تەرازووەکە وەکو یەك وان دەوەستێت، کاتێك یەکێکیان شتێکی قورسی لەسەر دابنێیت خێرا ئەوی تریان بەرز دەبێتەوە، بەڵام کە شتێکی لەسەر دابنێیت کە تۆزێك لەوی تریان قورستر بێت، بزانە چەند جار دێت و دەڕوات؟!، بەرز دەبێتەوە و نزم دەبێتەوە، پاش زەمەنێك دەوەستێت، ئایا ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم تەرازووە (اختیار)ی هەیە؟!...ئەها مەولانا چۆن نەیزانیوە؟!... مەبەستم لەوە ئەوەیە کە دەبێت فێربین ، هەر کەسە و بە گوێرەی پسپۆڕی خۆی داوامان لێی هەبێت. هەتا لەسەردەمی خۆمانیشدا ئەو کێشەیە هەیە، بۆنمونە: بەتەمایە ئەو کەسەی کە لە (فقە)دا شارەزایە وەڵامی پرسیارە سیاسییەکانیش بداتەوە و وەڵامی پرسیارە ئابوورییەکانیش بداتەوە. ئەم بابەتە بە بۆچوونی من هەڵەیەکی لۆجیکییە، ئێمەی موسوڵمان دەبێت ڕاستی بکەینەوە ، ناتوانین بگەینە بابەتە ڕۆحییەکان لەڕێگەی کایە ڕۆحییەکانەوە نەبێت ، ناتوانین لە شەرعدا شارەزا ببین یان  یان لە فیقهدا لە ڕێگەی (فیقە ناسییەوە) نەبێت، وە هەروەها ناتوانین لە فەلسەفەشدا شارەزابین لە ڕێگەی فەلسەفە ناسییەوە نەبێت، تێکەڵ کردنی ئەم کایانەش سەرمان لێ تێك دەدات

**گۆڤار ی ڕوون: با بێینە سەر بەشی سێیەمی دیدارەکەمان ، کە باس لە ئیسلامی کوردی دەکەین وەك  بەشێکی سەرەکی لە ڕیفۆرمی ئایین، ئیسلامی کوردی و وەرگێڕانی کەلتوری چییە؟**

**تەحسین حمە غریب:** لە پێشدا باسی ڕیفۆرمان کرد کە وتمان ئاین بۆ ئەوەی کە درێژە بە ژیانی خۆی بدات، دەبێت ئەو بەشانەی ئایین کە پابەندن بە زەمەن و شوێن و کاتەوە و بڕیارە گۆڕانکارییان بەسەردابێت، ئەگەر ئەو گۆڕانکارییە نەبێت ئایین ناتوانێت درێژە بە ژیانی خۆی بدات. نەتەوە یەکێکە لەو کایانەی کە دەبێت ئایین بابەتە ئایینییەکانی قبوڵ بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت لەناو ئەو نەتەوەیەدا درێژە بە ژیانی خۆی بدات، چونکە نەتەوە تەنها دیوی دەرەوە نییە وە ئێمەی کورد تەنها جلی کوردی نیین ، وە تەنها خانووی کوردی یان شاری کوردی نییە کە نەتەوەی کوردی دروست کردووە، شتێکی قوڵتر لەمانەیە، ئەو ئەزموونانەی کوردە ئەو ئەزموونە ڕووحی و مەعنەوییانەیە کە لە نێوان کوردەکاندا هاوبەشە، ئەسڵەن ئەوە ناوەڕۆکی نەتەوەیە،من لە یەکێك لە  تیۆریەکانمدا ناوم ناوە نەتەوایەتی ناوەڕۆکدار. نەتەوە شتانێکی نەبینراوی هەیە، ئەزموونی هاوبەشی هەیە، ئەو شتانەی هەیە کە ناکرێتە قسە، ئێستا من و تۆی کورد هەر کە یەکتر



دەبینین بە شتێك لە یەکتر تێ دەگەین بە بێ ئەوەی  قسەش بکەین. عەرەبێك و کوردێك دەشێ هەردووکیان جلی کوردی لەبەر بکەن بەڵام ڕۆحی هاوبەشی نەتەوایەتییان جیاوازە لە یەك. کاتێك ئایینی ئیسلام دێتە ناو کوردەوە، بۆ ئەوەی لەناو کوردا درێژە بە ژیانی خۆی بدات، بۆ ئەوەی جێکەوت لەسەر کورد دروست بکات وە بۆ ئەوەی کورد بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێت خودا ناسی بکات،  دەبێت مامەڵە لەگەڵ ئەو دیوە قوڵەی نەتەوەی کوردا بکات، لەگەڵ ئەو ئەزموونە هاوبەشانەی کە لە نێوان هەموو  کوردەکاندا بوونی هەیە. لەبەر ئەوەی ئەزموونی نەتەوەیەك جیاوازە لە ئەزموونی نەتەوەیەکی تر، بۆنمونە ئەزموونی ئێمەی کورد جیاوازە   لە ئەزموونی تورکەکان، ئەزموونی تورکەکان جیاوازە لە ئەزموونی فارسەکان، لەبەر ئەوە جۆری ئاینداری واتە مامەڵەی ئیسلام لەگەڵ ئێمەدا جیا دەبێتەوە لەگەڵ جۆری ئاینداری فارسەکان وە جۆری ئاینداری فارسەکان  جیاوازە لەگەڵ جۆری ئاینداری تورکەکان، ئاینیش بەم شێوەیە درێژە بە ژیانی خۆی دەدات، لەبەر ئەوە ئیسلام  بە شێوە گشتییەکە هەر یەك ئیسلامە، هەر ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا درودی خودای لەسەر بێت هێناویەتی،  بەڵام ئەزموون کردنی نەتەوەکان لەگەڵ ئەو ئاینەدا جیاوازە، ئەزموونی ئێمەی کورد جیاوازە، ئێمە دەبێت ئەو  ئیسلامەمان قبوڵ بێت ، وە ئەو ئیسلامەش زیندووە لەناو دڵی ئێمەدا، وە ئەو ئیسلامەش دەتوانێت درێژە بە  ژیانی خۆی بدات کە گونجاوە لەگەڵ ئەو دیوە نەتەوەییەی ئێمەدا، بۆ ئەوەی ئەمەش ببێت ئەو دیوەی ئیسلام کە پەیوەندی بە نەتەوەیەکی وەك عەرەبەوە هەبوو، چونکە لە مێژوودا سەرەتا لەناو عەرەبدا دروست بووە وزۆرتر بڵاوبووەتەوە، بەهەرحاڵ ئەوەی پەیوەندی بە نەتەوەیەکی ترەوە هەیە بیگۆڕین بە هاوشێوەکەی لەناو نەتەوەکەی ئێمەدا، مەبەستم لە ئیسلامی کوردی ئا ئەمەیە، نەك ئیسلامێکی تازە دابهێنین جیاواز لەوەی کە پێغەمبەری خودا هێناویەتی. نەخێر ئەو بەشەی یان ئەو بەرگەی کە لە ناو ئیسلامدا بەرگێکی عەرەبییانەی هەیە بە دڵنیاییەوە خۆی بۆ خۆی بەشێك نییە لە ئیسلام، بۆیە دەتوانین بیگۆڕین وە بیگونجێنین لەگەڵ ئەو هاوشێوە بەرگەدا کە لەناو ئێمەی کوردا بوونی هەیە.

بەرگەکە مەبەستم جل نییە، ئەو عورف و عادەت و ئەزموونە ڕۆحییانەیە کە لەناو کوردا بوونی هەیە،گۆڕانی بەم شێوەیە پێی دەوترێ ڕیفۆرمی ئاینی وە وەرگێڕانی کەلتوریشی پێ دەوترێت.لەبەر ئەوە ئێمە ئیسلامێك ئەزموون دەکەین وە ئیسلامێك ئەچێژین کە لەگەڵ نەتەوەی ئێمەدا وە لەگەڵ ئەزموونە قوڵەکانی ئێمەدا گونجاوبێت.بۆیە دەبینین ئەو فۆڕمانەی ئاین کە دێن لە دەرەوە گونجاو نین لەگەڵ ڕۆحی نەتەوەی ئێمەدا خێرا دەر دەکەون و دیارن و نامۆن بە ئەم



نەتەوەیەو تۆ ناتوانیت دەرکیان بکەیت، تۆ سەیری ئیسلامی مەحوی و ئیسلامی سەلەفییەك بکە.لەڕاستیدا ئیسلامی مەحوی گونجاوە لەگەڵ ڕۆحی ئەو نەتەوەیەی ئێمە بۆیە تۆ چێژ لە شیعرەکانی مەحوی دەبینیت، خۆ باسی ئیسلام دەکەن، ئیسلامی مەولەوی گونجاوە لەگەڵ ڕۆحی نەتەوەکەی ئێمەدا بۆیە تۆ چێژی لێ دەبینیت، بۆیە تۆ خۆتی تێدا دەبینیتەوە، خۆ باسی ئیسلام دەکات.بەڵام کاتێك کەسێك دێت فۆرمێکی دەرەوەی کورد دێنێت بۆ ناو ئیسلام گونجاو نییە بۆ ناو کوردستان گونجاو نییە لەگەڵ کوردستاندا، هەست دەکەیت ناتوانێت ئەو ڕۆڵەی خۆی ببینێت کە بڕیارە ببینێت، لەبەر ئەوە مەبەستمان لە ڕیفۆرمی ئاینی یان ئیسلامی کوردی، ئەو فۆرمەی ئیسلامە کە گونجاوە لەگەڵ ڕۆحی نەتەوەی ئێمەدا، ئەڵبەتە لەسەر حیسابی ئیسلام نا بە واتای ئەوەی ئیسلامەکە بگونجێنێت لەگەڵ نەتەوەدا، خۆی بۆخۆی هەر گونجاوییەکی قوڵ لە نێوانییاندا دروست دەبێت، چونکە ئاشنا دەبن بە یەك.کاتێك کە من تۆ دەناسم لەبەر ئەوە نییە کە سەیری چاو و گوێ و قژت دەکەم، لەبەر ئەوەیە من و تۆ ئاشنایی لە نێوانماندا دروست دەبێت، من و تۆ ئاگا ئەبین بەیەك تۆ ئەگونجێی لەگەڵ مندا و منیش ئەگونجێم لەگەڵ تۆدا نەك گونجانێکی میکانیکی گونجانێکی ئەزموونی ڕۆحی قوڵ، گونجانییەکی هاوشێوەی ئەوەش لە نێوان ئیسلام و کوردا دروست دەبێت وە مەبەستمان لە ئیسلامی کوردی ئا ئەوەیە.

**گۆڤاری ڕوون: لە بەشی دووەمی کتێبی ڕیفۆرمی ئاینی و ئیسلامی کوردیدا باس لەوە دەکەیت کە** ئیسلامی کوردی جیا لە ئیسلامی نەتەوەکانی تر ئیسلامێکی عیرفانییە.پێت وا نییە ئێستا ئەو جۆرە ئیسلامی بوونە ڕوو لە پاشەکشە دەکات؟ یاخود کوردەکان پشت لە عیرفان دەکەن؟.

**تەحسین حمە غریب :** لەڕاستیدا ناکرێت چونکە هەتا کورد بمێنێت ئەو ئەزموونە قوڵەی کورد لەگەڵ ئایندا کە بریتییە لە ئەزموونێکی ڕۆحی و عیرفانی هەر دەمێنێت و ئەمە کاتێك نامێنێت کە کورد نەمێنێت وە تا ڕۆژێك کورد بمێنێت ئەمە هەر دەمێنێت. بەڵام نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە ڕاگەیاندن وە هەندێك کەناڵ وە پشتگیری ماددی هەندێك دەوڵەت، ڕەنگە فۆرمێك لەسەردەمێکی کورتدا وەك کەف دەریا لەسەردەمێکدا زۆر بکەن، کۆمەڵێك گەنج سەرسامن بە لایەنێك یان فۆرمێك و بیرکردنەوەیەك کە گونجاو نییە لەگەڵ ئەم بابەتەدا. بەڵام ئێمە دەبێت دڵنیابین لەوەی کە ئەمە تەنها کەفەکەیە لە دەرەوە ئەگەرنا جەوهەرەکە هەمان جەوهەرە وە من پێچەوانەی ئەمە دەبینم، ڕاستە ئێستا کەسانێك هەیە لەبەر ئەوەی کە ئاینی خۆیان خۆشدەوێت دیوێکی سادەی ئاین کە خێرا وەڵامەکانیان دەداتەوە یەکسەر قبو ڵی دەکەن لە کەناڵەکانەوە یان



هەر شتێکی ترەوە بەڵام ئەوانەش کە تونییێتی قوڵیان هەیە وە ئەو گەنجانەش تونییێتی عیرفانی قوڵیان هەیە بۆ ئاین هەرگیز بەوە تێر نابن.

تۆ سەیری فەیسبوك و ئینتەرنێت و کەناڵەکان بکە بزانە کامیان زۆرتر تەماشای ئەو بابەتانە دەکات وە کامیان گونجاوترە لەگەڵ ڕۆحی ئەم نەتەوەیەدا وە لە هەموو سەردەمێکیشدا ئەم بابەتانە بوونی هەیە، چونکە ململانێ فیکرییەکان بوونی هەیە. بەڵام دواجار ئەوەی کە دەمێنێتەوە ئەوەیە کە لەگەڵ دیوە ئەزموونییە ڕۆحییەکەدا گونجاوە.

**گۆڤاری ڕوون : کەواتە بۆچی لەم سەردەمەدا (نالی و مەحوی و مەولەوی)یەکی تر دروست نابێت؟**

**تەحسین حمە غریب** : لەڕاستیدا نەتەوەی کورد نامۆبوونمان بۆ دروست بووە لەگەڵ ڕۆحی خۆماندا. هەندێك جار کەسێك کە توشی(تا) دەبێت، وڕێنە دەکات، شتانێك دەڵێت کە پەیوەندی بەوەوە نییە، هەندێك شت بە واقیع دەزانێت و واقیع نییە، نامۆ بووە بە خۆی

ئێمەش لەم کاتەدا لە حاڵەتێکی لەو شێوەداین ، ئەگەر نا ئێمە بگەڕێینەوە باری ئاسایی خۆمان و لەم (تا)و نەخۆشییە ڕزگارمان بێت و تەندروستی خۆمان وەربگرینەوە، بەدڵنیاییەوە (مەحوی و نالی و مەولەوی)مان تێدا دروست دەبێتەوە ڕەنگە قوڵتر و گەورەتریش.

بێگومان سەردەمی نوێ هەر (تا) دروست دەکات، بەڵام خەڵکی وا دەزانێت تەکنەلۆجیا و شتانی تری نوێ وای کردووە کە ئێمە جارێکی تر ئەوانەمان تێدا دروست نەبێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە لە ئەزموونە ڕۆحییەکاندا، خۆ(نورسی) زۆر نییە لەناو کوردا دروست بووە، ئێمە چوزانین کێ ناڵێت لە داهاتوودا ئەزموونی وەکو گروپ لەو شێوە دروست نابێت؟.

کێ ناڵێت کاتێك کە ئێمە لەگەڵ ڕۆحی خۆماندا ئاشنا دەبینەوە داهێنانەکانی خۆمان لەبواری هونەر و بوارەکانی سەردەمی نوێدا و لەبواری تەکنەلۆجیا و تەنانەت لە بواری بابەتە ڕۆحییەکانیشدا لەم سەردەمەدا برەو پێ نادەین، گرنگ ئەوەیە کە ئێمە ڕاستگۆ بین لەگەڵ خۆمان، ئیتر ئەوە گرنگ نییە کە ئایا دەبینە خەڵکێکی گەورە،پیاوێکی گەورە، ئینسانێکی گەورە،نەخێر، ئێمە دەبێت دڵنیابین کامە هەقە شوێنی بکەوین، کامە گونجاوە لەگەڵ ڕۆحی ئێمەدا شوێنی بکەوین، ئیتر با خەڵکیش نەمان ناسێت ، گرنگ ئەوەیە کە ئێمە مرۆڤێکی ڕەسەن بین، بە کورتی ئیسلامی کوردی ئیسلامییەکی عیرفانییە، ئەو کاتەش کورد دینداریيەکی ڕاستەقینە و ڕەسەن دەکات کە بەم جۆرە دینداری بکات، ئەگەرنا جۆرەکانی تری دینداری هەڵبژێرێت لەگەڵ خۆیدا نامۆ دەبێت.



# جیاوازی نیوان

# الدین و الشرع



**دوکتور مصطفی زلمی**

یەكیك لە پێداویستیەكانی خوایی لەسەر هەموو مروڤایەتی لە سەرەتاوە تا كوتایی ئەوەیە كە بی ( دین ) نەبن و دیدێكی خواییان هەبێت ئەویش ئەو سروشتە پاكەیە كە مروڤایەتی لەسەر راهیناوەو بە بیٚ لادان ئەمە وەكو (دین). بەلاٚم خوای گەورە لە هەر ساتەو كاتێكدا شریعەت و پێغەمبەری تازەی بۆ ناردوون لەگەل كەمێك جیاوازی جزئی (فرعی) بو هەر شەریعەتێك. كەواتە جیاوازی هەیە لە نیوان (الشریعة _ الدین ) لەم خالاٚنەی خوارەوە:

1– شریعەت بو ریٚكخستنی ژیانی دنیایە (عالم الشهادە) .

2– دین بۆ رێكخستنی ژیانی دواڕوژە (عالم الغیب)

3- شریعەت گۆڕین (نسخ )ی بەسەردا دی، بەلاٚم دین درێژ بوەوەی ئومەتانی ترە و نەگۆرە و (نسخ)ی بەسەردانایەت،شریعەت جیاوازە بە پێی ئومەتەكان.

4 – هەر ئومەتیو شەریعەتیكی هەیە ( لكل جعلنا منكم شرعه ومنهاجا) بەلاٚم یەك دینە بو هەموو شەریعەتەكان شریعەت رێگر نییە بو هەولٚدانی مروڤ تیایدا لەكەل ئەوەش دا كە دەقەكان (ثابتن) بەلاٚم جیاوازە لە رووی واتاو (تطبیق) دا وە لە رووی كات و شوینەوە نمونەی





(القوة)و(رباطالخیل) لەم ئایەتە پیرۆزە دا (وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخیل ترهبون به عدو الله وعدوهم وآخرين من دونهم ) کاتیك ئەم ئایەتە دابەزی ئەو قوەتەی موسڵمانان بەکاریان هیناوە بریتی بوولە:

( 1–شمشیر 2– رم 3– درع ) ، وە بەڵام ئیستا بریتییە لە هەموو ئەم چەکە داهێنراوە وەهەتا چەکی (النووی) وە پاشانیش (رباط الخیل )لەو سەردەمە بریتیبوە : لە چەند حەیوانیك بەڵام ئیستا بریتیە لەم هەموو وەسائیلە هەوایی و بەحریی و وشکانییەکان بە بیی بەرەو بیش جوونی تەکنەلوجیا



5- دین ڕێك بە (اجتهاد)ی مرۆڤ نادات لەبەر ئەم دوو هوکارە:

أ- دین شتی سروشتیەو ناگورِیَ بە جیاوازی کات شوین و کەس هەروا هاتوەو هەروا ئەرِوات.

ب- دین وتمان لە (عالم الغیب ) دەکوڵیتەوە لەبەر ئەوە عەقڵیش توانای گۆڕین و زالبوونی نییە بەسەر شاراوەکاندا

6- دین بریتیە لە بابەتە بنچینەییەکان بەڵام شەریعەت بریتیە لە بابەتە لاوەکیەکان واتە (فرعیات)

7- دین سەرچاوەیەکە ئەتوانریت جێگیر بکرێت و بسەلمینریت لەرێگەی عەقلێکی سەلیمەوە بە بەڵگەی عەقلی و ئەپێورێت (الوحی الإلهی) پاشان هەڵگەرانەوەیش لە دین ئەبی (ومن يرتدد منكم عن دينه ) کەواتە ئەریەکی هەڵگەڕێتەوە واتە ئیمانی بەخوا نەماوە کە ئەوەش بنچینەی دینە .

سەرچاوە

الدکتور مصطفی الزلمی، أسس العلاقات الودية بين الشعوب والأمم في القرآن الكريم



# لەمپەڕەکانی بەردەم نوێبونەوەی فکری ئیسلامی

جەمیل عوسمان



کاتێك قسە لە نوێبونەوەی فکر وتێگەشتنیدینیمانئەکەین،واتەقسەمانلە پرسی ڕیفۆرم کردوە،ڕیفۆرمیش لە خاڵی لاوازەوە دەست پی ئەکات بۆ خاڵی هێز،واتە سەرەتا ئەبێت دەستنیشانی لاوازیەکانی فکر و تێگەشتنمان بۆ ئیسلام بکەین،وکار لەسەر نەهێشتن و کەمکردنەوەی بکەین،دواتر کار لەسەر بەهێزکردن و گەشەپێدانی خاڵەبەهێزەکانی بکەین فەزای فراوانتری پێببخەشین.

بۆیە لەپرسی نوێبونەوەی فکری ئیسلامی دا سەرەتا ئەبێت ئەو لەمپەڕوبەربەستانە تێکبشکێنین کە بوار نادەن هزر و تێگەیشتنمان لەچوارچێوەی بەرژەوەندیە مرۆییەکان و خواستی ئیسلام و واقیع دا نوێگەری بکات و تەفسیر و تێڕوانینەکانی قۆناغەکانی سەدەکانی ڕابوردوو تێپەڕێنێت،ئەڵبەت ئەو بەربەست ڕێگریانەی کە نامۆ و ناحەزن بە پرسی ڕیفۆرم و نوێگەری و بوار نادات بە پرۆسەی نوێبونەوە و خۆگونجاندنی هزری ئیسلامی لەتەك پرس و چەمکە هەستیارەکانی سەردەمدا،لەبەرئەوە ئەبێت بەر لەهەموشت ئەو گرفتە چارە بکرێت و دیواری کۆنکریتی ئەو عەقلێەتانە تێکبشکێنین کەلە هەناوی مێژوو دا سۆراخی وەلاَم وچارەسەری پرسەکانی سەردەم و کۆمەلگای ئیسلامی ئەکەن،بەبڕوای من گەورەترین وترسکناکترین لەمپەڕ لەبەردەم نوێبونەوەی فکری ئیسلامی دابەگشتی لەم شتانەی خوارەوەدا خۆی ئەبینێتەوە.

## یەکەم: تاکڕەوی دەستەلآت و سەرکوتکاری سیاسی:

بە درێژایی مێژوو دیکتاتۆر و دەستەلآتی ستەمکار لەجوڵەو نەفەسی نوێبونەوەو ڕیفۆرم ترساون،بۆ بەردەوامی ومانەوەیان لەسەر کورسی وتەختی دەستەلآت پەنایان بۆ زەبر وزەنگ و کوشتن و خەفەکردنی ڕیفۆرم خوازان بردوە،حاشاهەڵنەگرە کەوا لەمێژووی ئیسلامی دا یەکێك لەهۆکارکانی چەقبەست و بەجێمانی هزر و بیری ئیسلامی بەهۆی تاکڕەوی و خۆسەپاندن و

ستەمی زۆرێك لە سوڵتان و خەلیفەکانەوە بوە،بۆ خنکاندنی ئەو دەنگ و ئاوازانەی کە دژ بە ستەم و مێژوو پەرستی دینی بوون سەرەتا پەنایان بۆ موفتی و واعیزەکانی سێبەری سوڵتان بردوە تاوەك لەبەرچاوی عامەی کۆمەڵگاو خەڵکە ناهۆشیارەکە لەکەدار بکرێن ولەبازنەی دین دەریان بکەن دواتر خوێنیان حەلاڵ و عەقلّ وفکریش یان حەرام قەدەغە بکرێت،لەمیژووی ئێمەی موسڵمان دا کەمنین ئەو زاناو فەیلەسوف وعارفانەی کە دەستەلآت خوێنی ڕشتوون یاخود نەفی کروون،کەواتە لەسایەی ستەم و دیکتاتۆر دا قسە کردن لەپرسی نوێبونەوە و داهێنان لە هزر و بیری ئیسلامی دا خەونی مەحالّ و ئاسنی سارد کوتینە.لە کۆندا دەستەلآتی خۆسەپێن و حوکمی بنەماڵەیی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی،لە ئێستاش دا دەستەلآتە دیکتاتۆر و شکستخواردوەکانی بزاڤی عەلمانی وهەروەها دەستەلآتە دینی ومەزهەبیەکانی سعودیە و ئێران و سۆدان و ..جیهانی ئیسلامی بەگشتی باشترین شایەتی ئەو ڕاستیەن.

## دووەم: خوێندنەوەی فیقهی ومەزهەبی بۆ ئیسلام:

سەردەمانێك قوتابخانەو مەزهەبە کەلامی و فیقهیەکان گوزارشتیان لە فرەیی و جیاوزای بیرو بۆچونی زانایانی ئیسلام ئەکرد،دەستەلآت نەیئەتوانی ڕێگا لە بیرو بۆچونی جیاواز بگرێت وهەموان ناچار بکات وەك سوڵتـان وتاقمەکەی بیر بکاتەوە،ئەوەبوولەگەلّ لەکارخستنی سیستەمی شوراو سەپاندنی سیستەمی بنەماڵە،مەدرەسەی ئیعتیقادی و مەزهەبی فیقهی دروست بوو، زەمەنێك زاناو فەقیهەکان لەچوار چێوەی یاساو ڕێسا کەلامی و مەزهەبیەکانا ئیجتیهاد و داهێنانیان لە بیر و تێگەشتنی ئیسلامی کردوە و جیهانیك شاکار و بەرهەمی ناوازە و بەسودیان خستۆتە سەر خەرمانی شارستانیەت ومەعریفەی ئیسلامی،بەلآم لەسەردەمی عەباسیەکانا بەمردنی مەئمون و هاتنی متەوەکیل بۆ سەر تەختی دەستەلآت دەرگا بەڕوی ئیجتیهاد و نوێگەری دا دائەخرێت،دەیان زانا و کەلامی وبیرمەند ئەخرێنە سوچی زیندان وژێر ئەشکەنجە،دیارە هەموو ئەمانە بەپاڵپشتی مەعنەوی ڕەوتی سەلەفی ڕوی داوە،ئیتر لەو ساتەوە هەتا ئەمڕۆ فکر و فیقهی ئیسلامی چەقی بەستوە و هەمان ئەو پێوەر و ڕێسا کلاسیکی و مێژوویانەی سەدەکانی ناوەڕاست و پێشتر کاریان پیّ ئەکرێـت،خۆ ئەگەر لەشوێنێك شتێك یان ئیجتیهادێکی نویّ کرابێـت نەیتوانیوە ئەو پێوەر و چوارچێوە مەزهەبیە قەدیمانە تێپەڕێـنێـت،لەوەش سەیر تر ئەوەیە کە لەناو دەزگاو ناوەندە مەعریفی و زانستیەکانی وەك زانکۆ و پەیماناگا و خوێندنگائاینیەکانیش دا



هەمان بۆچون وشرۆڤەکانی مێژووی سەدان ساڵ لەمەوبەر ئەخوێنرێت و لەعەسری تەکنۆلۆجیاو و مرۆڤ سەنتەری دا فەتوا خوێناویەکانی هەناوی مێژوو تیرۆریزە ئەکرێت و شەرع و ئیسلامی پێ مەحکوم ئەکرێت،هێشتاله ناوەندەکانی دین و فەتوا دا حوکم ویاسا فیقهی ومەزهەبیەکانی وەك کوشتنی موسڵمانی نوێژنەکەر و مورتەد وکەوتنی تەلاقی سێبەسێ ومارەبەجاش ڕەجم،حوکمی صەوابی شەرعە لەقناعەتی زۆرینەی مامۆستایانی ئاینی ڕەوتە ئیسلامیەکان و تەسەوف و سەلەفی دا،هێشتا باس هەر باسی دابەشکردنی کۆمەڵگایە بۆ دار الحرب و دار الكفره،بێگومان ئەم تێگەشتن و پۆلێن کردنەی مرۆڤ کۆمەڵگا زادەی تێەشتن و بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی عەقڵیەتی خیڵ و خۆسەپاندن بوە، داڕشتنەوەی ئەرك و مافەکانی مرۆڤ و ژن بەتایبەت لەزەمەنی پیاو سالاری و غیابی زیاتر لەنیوەی کۆمەڵگا بوە کە ژنە،ئافرەت لەهەموو تەمەنی دا تەنها دوو جار ماف لەماڵ دەرچونی هەبوە،یەکەم کاتی شوکردن لەماڵە باوکەوە بۆ ماڵی هاوسەر،دووەم کاتی مردن له ماڵی خۆیەوە بەرەوەگۆڕستان،ڕەنگە ئەم فەتوا وشرۆڤە قەدیم وقورسانە بۆ زەمەنی خۆی پەسەندی عەقڵ و بەرژەوەندی خیڵ و کۆمەڵگای داخراو بوبێت،بەلاّم لەم سەردەمی دیموکراسی و ماف ژن وکەمینەو مرۆڤ سەنتەری (هیومانیزم) دا ئەم تێگەشتن و ڕوئیا کۆن و ماوە بەسەرچوانە لەبری ئەوەی کۆمەڵگای موسڵمان بەرەوبەختەوەری و ئامانجە بالأکانی ئیسلام ئاڕاستە بکات، دابڕان دوورکەوتنەوە و ئیزدیواجیەت فەراهەم دێنێت،بۆیە ئەرکی نوخبەی ڕۆشنبیر و بیرمەندانی بزاڤ ئیسلامیە بەر لەهەمووشت کار لەسەر داڕشتنەوەی گوتارێکی ئیسلامی هاوچەخ و فیقهێکی سەردەمیانەبکەن، کە بەریەك کەوتنی لەتەك ڕۆحی ئیسلام و بەرژەوەندیە بالأکانی کۆمەڵگاو کەرامەتی مرۆڤ دا نەبێت،وتێگەشتنی کۆنی ئاینیمان لە کوێدا ناکۆکی وبەریەك کەوتن دروست ئەکات بخرێتەوە ناومێژوی ئیسلامی و تەنها وەك پاشخان وکەلەپور مامەڵەی لەتەکدا بکرێت.

## سێیەم: ناکۆکی و ململانێی نێوان شێعەوسوننە:

بێگومان جیاوازی لە بۆچون و تێگەشتنا حاڵەتێکی سروشتی و بەڵگەی زیندویەتی کۆمەڵگای ئیسلامیە،هیچ هێزو دەستەلأتێکی ئیسلامی بە درێژایی مێژووی خەلافەتەکان سەرەڕای بەکارهێنانی زەبر و زەنگ نەیتوانیوە ڕێگا لە جیاوازی و فرەیی بگرێت،بونی دەیان مەزهەبی فیقهی و مەدرەسەی کەلامی بەڵگەی ئەو ڕاستیەن،بەلاّم من لێرەدا مەبەستم ناکۆکی ودوو بەرەکی ڕەوتە ئیسلامیەکانە.وەك قوڵکرنەوەی خیلاف و جیاوازیەکان بۆئاستی نەفی کردن و سڕینەوەی



بەرامبەر بەجۆرێك كەنەتوانن لەسەر خاڵە هاوبەش وجەوهەریەكان پێك بێن،وەك ئەوەی ئەمڕۆ ڕوو ئەدات بەتایبەت ململانێ و ناكۆكیەكانی نێوان شێعەو سوننە كە هەمو سنوریكی ئیسلام و ئینسانیەت و ئەخلاقی تێپەڕاندوە، جەنگی تائیفی و خوێناوی ولأتانی خاوەن پێكهاتەی مەزهەبی دەرهاویشتەی قوڵبونەوە و نەفی كرنی یەكتریە،دەرەنجامی فەتوا و تێگەشتنی دەمارگیرانەو دڵڕەقانەی زاناو مەلا مەزهەبیەكان ونیزامەسیاسیەكانی شێعەو سوننەیە،زاناكانی شێعەو سونە لەسەر سەماحەت و میهرەبانی خواو پێغەمبەر و شەرع كۆكن،بەلأم خۆیان نەیان توانیوە ئەو لێبوردەیی و میهرەبانیەی ئیسلام بۆ كایە كۆمەلأیەتی و ژینگە ئاینی و مەزهەبیكەی خۆیان تیرۆریزەبكەن،بێگومان ناكۆكی نێوان شێعەو سوننە بۆ زیاتر لە هەزار ساڵ ئەگەڕێتەوە وخوێنی سەدان هەزار موسڵمانی تیا ڕژاوە،هۆكاری ئەو تاوانە گەورەو قێزەونانەش بۆ نەبونی ئیرادەی لێك تێگەشتن و یەكترخوێندنەوە ئەگەڕێتەوە،بۆیەپرسی ڕیفۆرم ونوێبونەوەی فكری ئیسلامی بەغیابی هەر یەك لەم دوو ڕەوتە دەستكەوتی مەزنی نابێت،سەرەتا ئەبێت كار لەسەر كەمكردنەوەی ناكۆكیەكان بكرێت،بێگومان كەم تازۆر لەلایەن هەندێك كەسایەتی ڕیفۆرمخوازەوە هەوڵ ی نزیك كردنەوەی مەزهەبەكان دراوە،لەمێژووداچەندین زاناو عارفی مەزنی وەك مەلا صەدرا وعبدالرحمن الكواكبی جەمالەدینی ئەفغانی ومحمود شەلتوت ی میسری و....تاد هەولگەلێكی زۆریان بۆ كۆكردنەوە ی شێعەو سونەومەزاهیبەكانی ترداوە،بەلأم جەهلی كۆمەڵگاو بەرژەوەندی دەستەلأت و دەمارگیری وبیرتەسكی فەقیهـ و مەلاكان لەمپەڕ بوە لەبەردەم ئەو ئەركە پیرۆزەدا،ڕەنگە لەئێستادا هەل ومەرجەكە پێگەشتبێت و واقیع و ژینگەی جیهانی ئیسلامی تاڕادەیەك لەبار بێت بۆ لەیك تێگەشتن و ڕێكەوتنی مەزهەب ومەدرەسە دینیەكان بۆ سەرلەنوێ دارشتنەوە و ڕێكخستنەوەی بیرو بۆچون تێگەشتنە دینیەكان و وەلانانی ناكۆكی و دەمارگیری چونكە نە بەڕۆحی ئیسلام گونجاوە نەبەرژەوەندی كۆمەڵگاش قبوڵی ئەكات.

## چوارەم: ڕەوتی سەلەفی :



گەورەترین و دژوار ترین لەمپەڕی بەردەم نوێبونەوی فکری ئیسلامی و تێگەیشتنی ئاینی بریتیە لە سەلەفیەت بەتەواوی فۆرم و باڵەکانیەوە،ڕوئیای سەلەڤی لەسەر بناغەی دابەشکردنی کۆمەڵگا بۆ دۆزەخی و بەهەشتی وئیمان و کوفر دامەزراوە،ئەوان بە بەبەڵگەی فەرمودەیەکی لاواز ئومەتی موحەمەد ئەکەن بە حەفتاو سێ گروپ و جگە لەدانەیەکیان –کە تەعبیر لە خۆیان ئەکات– هەمووی ڕەوانەی دۆزەخ ئەکەن ،وەك حەسەن سەقاف ئەڵێت: توندڕەوی وتەکفیری کۆمەڵگا لە فەرمودەی( فیرقەی ناجیەوە) سەرچاوەی گرتوە،بێگومان ئەم جۆرە بیر کردنەوە ترسناك وتێگەشتنەحەرفی و مێژووییە بۆ ئیسلام پێویستە بەرەنگاری بینەوە و بەتەواوی هەوڵ و توانامان دژایەتی فکری و مەعریفی ئەو عەقڵیەتە بکەین کە خاڵی هاوبەشی نێوان داعش ودەوڵەتی سعودیەو سەلەڤی مەدخەلی و سەلەڤی جیهادیە،بە تەعبیرێکی تر خاڵی کۆکەرەوەی باڵەکانی سەلەفیەتە لە تەواوی جیهانی ئیسلامی دا،ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژوو ئەبینین ڕەوتی سەلەڤی لەگەڵ دروستبونی دا بۆ شەرعیەت دان بەخۆی پەنای بردۆتە بەناشیرین کردن و تەکفیری نوێخواز و بیرمەند و فەلاسیفە،لەبەرامبەردا پەردەپۆشی ناحەقی وتاوانەکانی دەستەلأتە ستەمکار و



خۆسەپێنەکانیان کردوە، پێگەشتن و گەشەکرنی ئەو دیدە سەلەفیە بەرهەمی کەلتوری سوڵتان وخەلافەتی ناشەرعی مێژووە،لەهەر کوێ دیکتاتۆر حوکمی کرد سەلەفیش لەگەشەدایە،لەهەرکوێ فرەیی و پێکەوە ژیان و دیموکراسی زیاتر بوو بێگومان سەلەفیەت نامۆ ئەبێـەوە بەژینگەو کۆمەڵگا،یەکێکی تر لەنەهامەتیەکانی بیری سەلەڤی لەوەدایە کە بۆ لەکاتی پشتڕاسکردنەوە و



تەئصیل کردنی  بۆچونەکانیان بەدەقی قورئان و فەرمودە ڕەچاوی مەقاصید شەرع و سیاقی زەمەنی ومێژوو هۆکاری دابەزینی ناکەن،لەهەر کوێ دەقێکیان کەوتە بەرچاو هەوڵی جێبەجێ کردنی  حوکمەکەی ئەدەن،لەلایەکی ترەوەگرفتی سەلەفەیەت لەوەدایە کە لەمێژووا ئەژین،ئەوان پێیان وایە سەلەف صالّح بەشی هەموومان بیریان کردۆتەوە و ناکرێت جارێکی تر دەست بۆ بابەتەکانی تەفسیر و فیقهـ ببەین،ناکرێت نوێگەری لەچەمك و  فەهمی زاراوە قورئانی و شەرعیەکانا بکەین،چونکەهەر شرۆڤەو لێکدانەوەیەکی نوێ کە ناکۆك بێت بەبۆچونی زاناکانی سەلەف صالّح،  واتای بەزاندنی سنورە،ئەمە لە کاتێکایە کەلە ناو هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر و سەلەف دا  تائاستێکی جیاوازی و لەبیرو بۆچونیانا بەدی ئەکرێت لە تەفسیری دەق و شرۆڤەی فەرمودەکانی پێغەمبەر دا دخ، وەك خیلاف ئەبوبەکر و عومەر –خ ڕ– لەسەر  جەنگی پاشگەز بو،یاخود ڕاجیایی هاوەڵان لەدوای وەفاتی حەزرەت–دخ– لەبارەی هەڵبژاردنی خەلیفەوە،وەیان جیاوازیان لەسەر بەشکردنی ئەو زەوی ومولّکانەی کە ئەبنە دەستکەوتی موسڵمانان،کە ئایالەبن دەستی دەوڵەت دا بمێننەوە یاخود بدرێنە خەڵکی،ئەمەو دەیان جیاوازی تر لەسەرچەمکە قورئانی و شەرعیەکان،وە کاتێك باس لە حەرامی و نادروستی تەفرەقە و فرەیی دینی ئەکەن  لەمێژووی هاوەڵان دا  جیاوازی بابتێکی بەیهی بوە،کە عەلی کوڕی ئەبوتالّب خەلیفە بوو،موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانیش بۆ خۆی لەسنوری شام ومیسرخەلافەتێکی ڕاگەیاندبوو،ئەوانەش کەلەدەوری ئەم دوو خەلافەتە کۆبوبونەوە زۆرینەیان هاوەڵی پێغەمبەر بوون، ،یاخود جیاوازی عەلی وعائیشەو تەلّحەو زوبێر لەسەر  چۆنێتی و کاتی تۆڵەکردنەوەی خەلیفەی شەهید (عوسمانی کوڕی عەفان) –خ ڕ– قسە لێرەدا ئەوەیە سەرەڕای ناکۆکی و جەنگ وخوێنڕشتن هیچ یەك لەم بەرانە ئەوی تری لە بازنەی دین دەرنەکردوە،بەلاّم سەلەفیەت جیاوازی و فرەی قبولّ ناکات،ئەگەر بۆی بکرێت هەموان ناچار ئەکات وەك خۆی بیر بکەنەوە وتەنانەت لەپۆشاك ورواڵەت و داب ونەریتا وەك ئەوان بین،سەلەفیەت عیبادەت وعاداتی دینی تێکەڵ کردوە،پێی وایە مرۆڤی موسڵمان تەنانەت لە نەریتە کۆمەلایەتی و خێزانی و کەسێتیەکانیش دا ئەبێت خیلاف سەلەف صالّح نەبێت،واتە مردووەکان حوکم و سیاسەت و یاسابۆزیندوەکان دائەڕێژن،دیارە قسە کردن لەسەر دەرهاویشتەکانیی بیری سەلەفیەت زۆر هەڵدەگرێت،بەکورتی پرۆسەی نوێبونەوەی فکری ئیسلامی و خۆگونجاندنی لەگەڵ واقیع دا ئاسان نیە،بۆیە سەرەتا ئەبێت لەمپەڕ ە فیکری و دیوارە مەزهەبیەکان بروخێنرێت و زەمینەسازی بۆ ڕەخساندنی  فەزایەکی ئازاد و کۆمەڵگایەکی چاو کراوەو وشیار بکرێت.





# سەرنجێكی كورت لەسەركتێبی

## (دیدێكی نوێ بۆ كەلەپور وگوتاری ئاینی )

خوێندنەوەی: وریاباقر

ئەم كتێبە تازەترین بەرهەمی (د.هادی علی) كە كۆمەڵێك بیرو بۆچونی تازەی خستۆتە ڕوو، دەمانەوێت بەكورتی بەخوێنەری ئاشنابكەین كەباسی چی دەكات . گوتاری ئاینی دەبێت پشت بەستووبێت بە كەلەپور و مێژووی ئیسلام بۆسەرنج ڕاكێشانی مرۆڤەكان و ئاوڕدانەوەیان لە بەهابالأكانی ئیسلام وەك خۆی دەڵێت (گوتاری ئاینی سەردەم پشت بەستوو بە كە لەپور و مێژوو، بەداخەوە بەشێوەیەكی گشتی گوتارێكی ئیجابی و بنیات نەرانە نییە، بەڵكو زیاد لەپێویست تەقلیدییە و لایەنی عاتیفەو كاردانە و قبوڵنەكردنی یەكتر و باگەشەكردن بۆهونەری مردن سازی لەبری ژیان سازی بەسەریدا زاڵە.

بەڕادەیەك كەباسی ئەوەدەكرێت كەزانایانی سەلەف قسەیان لەسەر هەموو بوارەكانی ژیان كردووە و شتێك نەماوەقسەیان لەسەرنەكردبێت بۆدوای خۆیان، بۆ یەموسڵمانان بەسەردەمی ئیستاشەوە پێویستیان بەخۆماندووكردن نییە، بەڵكو هەر ئەوەندەبەسەكەخۆمان تەقلیدی ئەو ڕابردوەبكەین وەهەوڵی دوبارەكردنەوەی بدەین. زانا و بیریاری مەغریبی (د. احمد الرسیونی) كەشارەزایە لە فیقهی (مەقاصید) دا، پێی وایەكە پێویستە فكری ئیسلامی بكرێت بەسێ بەشەوە :





1- بەشێکی لەسەردەمی خۆی پێویست بووە لەسەردەمەکانی تریش و سەردەمی ئیستاشدا موسڵمانان دەتوانن سودی لی وەرگرن و بەکاری بهینن.

2- بەشێکی تری بۆ سەردەمی خۆی گونجاو بووە، بەلام بۆسەردەمەکانی دوای خۆی بەتایبەتی بۆ ئەم سەردمە گونجاونییە.

3- بەشی سێیەمی بۆ سەردەمی خۆشی ناردوست وناشیاو بووە، چونکە هەڵەو تاوان و کاری نادروست بکەرەکەی بووە وەك مرۆڤ.




هەر لەوکتێبەدا (د.هادی علی)، ڕاستکردنەوەیەك بۆچەمکی جیهاد دەکات، کەئەو لەو بڕوایەدایە جیهاد بابەتێکی ئەخلاقییە نەك عەقاعیدی وەك خۆی دەڵێت:

(جیهاد بەکارهێنانی هێزە لەئیسلامدا هەڵوێستێکی عەقاعیدنییە لەدژی بیٚ باوەڕان و کافران،بەڵکو هەڵوێستێکی ئەخلاقییە دژی ستەمکاران و زاڵمان )، چونکە پاڵنەروئامانجەکانی جیهاد بەپێی ئایەتەکانی قورئان سیٚ هۆکارن:

1- مافی بەرگری کردن لەخۆ وهەڵوێستەکردن لەستەم وناڕەوای (الحج 39- 40).

2- بۆ پشتیوانی لە چەوساوەکان و ستەملێکراوان (المستعضفین) کەتاوانای دیفاع کردنیان نییە(النساء 75 ) .



3- لەپێناو ماف و ئازادی عیبادەت و خواپەرستی بۆ هەموو خاوەن ئاینەكان(الانفال 39).

واتە لەڕوانگەی ئیسلامەوە جیاوازی ئاینی نابێتە پاساو بۆ بەكارهێنانی هێز ،چونكە جیهاد بەمانای( قتال ) لەئیسلامادا دژ بەزاڵمانە موسڵمان بن یاخود كافر و بی دین.

**خاڵە لاوازەكانی گوتاری ئاینی سەردەم:**

1- ناواقعی بوون بایەخدانی زیاد لەڕادەی سروشتی بەلایەنی میسالی ژیان پێشینان و وێناكردنیان وەك فریشتە وسۆپەرمان و مرۆڤی ئەفسانەی .

2- پشت بەستن بەگێڕانەوەی چیرۆك وداستانی ئەفسانەیی و خەون بینین وفەرمودە لاواز ودانراوكانی سەردەمەكانی چەقبەستن ودواكەوتووی مێژووی ئیسلامی .

3- كرچ وكاڵی ناوەڕكی وتارەكە لەڕووی زانستی و بابەتییەوە. هەروەها نەگونجان لەگەڵ بیرو ژیریدا.

4- زۆرێك لەوكەسانەی لەمەیدانی بانگخوازیدا و ڕێنمای ئاینی داكاردەكەن خۆیان زاناو پسپۆڕنیین و ئاستی زانستی و ڕۆشنیبریان لەئاستی ئەو بەرپرسیاریەتییە دانییە كە چونەتە مەیدانەكەوە.

5- موبالەغەكردن و زیادەڕوی لەخراپ و ێناكردنی دونیا پشت گوێ خستنی بەشێوەیەكی ناواقعی و ناعەمەلی كەنەگونجاوە لەگەڵ مەقاصیدی دیندا.

6- درێژەپێدان و دوبارەكردنەوەی بێ زاركەر، دەنگ بەرزكردنە و خۆتوڕەكردنی بێ پاسا و وروژاندنی ئەو بابەتانەی كەلایەنی سۆزداری، گیانی ڕق وكینە وكاردانەوەی توند و نەخوازراو لە دڵو دەرونی گوێگردا جێ دەهێڵێت.

7- هەندێك وادەزانن كەتەنها ئامۆژگاری و ڕێنمای كردنی ئاینی تیشك خستنەسەر هەندێك لایەنی پەروەردەی بەسە بۆ ئەوەی گویگرەكان سروشت و عادەت و سیفەتە خراپەكانیان بگۆڕن. بێ ئاگالەوەی كەئامۆژگاری كردن زیاتر لەڕاهێنانە وەرزشییەكانیان پی ئەنجام نادرێت

، چونكە مرۆڤ خاوەنی چەند خەسڵەتێكی نەگۆرە، جگە لەهەندێك گوڕانكاری ڕواڵەتی .